ڕۆژنامە - گۆڤار

11

# مەستوورە

## شازادەو حەسنای ئەردەڵان

نیگاری: سالار مەجید



بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییەو هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێك دەری دەکات

دەستەی ڕاوێژکاران
حسێن عارف
ڕەووف بێگەرد
ڕێبین ئەحمەد هەردی
سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس
بەڕێوەبەری ڕۆڤار
دلشاد عبدالله
سەرپەرشتی هونەری
قادر میرخان
کارگێڕ
عـــوسمان شـــەیدا
مۆنتاجی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سعید





**سالار مەجید:**

- 1961 لە هاوار لە دایك بووە
- 1983 پەیمانگەی تەکنۆلۆژی لە بەغدا تەواو کردووە.
- 1985 تـــا ســـاڵی 1997 (10) پێشـــانگەی تاییـــەتی کردووەتەوە.
- بەشداری 25 پیشـانگەی هاوبەشی لـــە دەرەوەو نـــاوەوەی کوردستان کردووە.
- ئێســـتا وەك نیگارکێشـــێك لـــە چاپخانـــەی ســـلێمانی کاردەکات.

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری‌یە
هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێك
دەری دەکات
ناونیشان
سلێمانی -فولکەی یەکگرتن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/
ڕۆڤار
ت / 29839-29609
لەدەرەوەی کوردستان
Tel: 0044162846008 Fax: 00441628477660
چاپخانە : ئۆفسێتی دلێر

# مەستورە

(1264ـ1220)

## نووسەری (تأريخ اردلان)

نەوشیروان مستەفا

-1-

### بنەماڵەکەی

باپیری مەستورە: محەمەد ئاغا، کە لەزۆری (فتوحات)ی خوسرەوخانی گەورەدا بەشدارو، خەزوری ئەمانوڵلاخانی گەورەو یەکێ لەباوەڕپێکراوە نزیکەکانی بووە، بۆ کۆکردنەوەی باج و سەرانەو، بۆ بەشداری لەشەڕو لەشکرکێشییەکانیدا، بۆ نوێنەرایەتی لەدەربای قاجاردا.

باوکی مەستورە: ئەبولحەسەن بەگ کوڕی محەمەد ئاغا، ژنبرای ئەمانوڵلاخانی گەورەو بریکاری حوسەینقولی خانی خوشکەزای بوە، ئەمیش باوەڕپێکراوێکی نزیکی ئەمانوڵلاخانی گەورەبوە، سەرپەرشتی زەماوەندی گواستنەوەی کچی فەتحعەلی شای قاجار بۆ خەسرەوخانی ناکام ئەم کردویەتی.

مامەکانی مەستورە: ئیبراهیم ئاغاو ئیسماعیل ئاغا، هەریەکە پلەیەکی بەرزیان هەبوەو، میرزا عەبدوڵلایش مونشی دیوان بوە. (حدیقە: لە321). میرزا عەبدوڵلای مونشی (رەونەق) نوسەری (تەذکەرەی حەدیقەی ئەمانوڵلاهی)یە، کە ژیاننامەی شاعیرە فارسی بێژەکانی ئەردەلان ئەگێڕێتەوەو نمونەی شیعرەکانیان ئەنوسێ‌و، عەلی ئەکبەری ئامۆزایشی نوسەری (حدیقەی ناصری)و (تأریخ الاکراد)ە.

دایکی مەستورە: لەبنەماڵەی میرزا عەبدوڵلای وەزیر بوە.

بنەماڵەی باوکی مەستورە: (قادری)و بنەماڵەی دایکی (میرزا عەبدوڵلای وەزیر) هەردوکیان لەبنەماڵە دەوڵەمەندو دەستڕۆیشتوەکانی سنە بون، تایبەتی بنەماڵەی وەزیر هەمیشە دەورێکی کاریگەریان هەبوە لەژیانی سیاسی، دارایی، جەنگی.. داوودەزگای ـ ـمڕانی ئەردەلان دا.

-2-

### لەدایکبونی

ماهشەرەف کچی ئەبولحەسەن بەگ، وەکو عەلی ئەکبەری ئامۆزای لە (حدیقە: ل321–322) دا نوسیویتی لەتەمەنی 44 ساڵیدا لە1264دا مردوە، بەم پێیە ئەبێ لە1220دا لەباوەشی ئەم خێزانە ئەجیبزادەیەدا لەدایک بوبێ، رەنگە هەواڵەکەی ئەم لەهی نوسەرانیتر دروستتربێ.

-3-

### پەروەردەو خوێندنی

مەستورە نۆبەرە، واتە یەکەم منداڵی دایك‌و باوکی بوە، لەبەرئەوە باوکی بایەخی بەخوێندن‌و پەروەردەکردنی داوە، خۆی لەم بارەیەوە ئەڵێ: (پاش ئەوەی لەسای خودای لەهەمو شتێ هەورازتر و لەپەنای بەزەیی داوەری بێ هاوتا لەزگی دایکمەوە کەوتمە باوەشی پەروەردەی باوکمەوە.. لەفەڕی ئەخشی نێوچاوانی بەهرەو هێزی بینای بەخشندەگی و لەبەرەکەتی ئەو ئەختەری چڵەپۆپەی زانست‌و خۆری گەردونی ئاوەزە کە مەیلی سروشتی‌و شەوقی راستەقانیی پەروەردەکردنی منداڵان‌و بەهێزکردنی جگەرگۆشان دا زۆربو، بەتایبەت منی یەکەم گوڵی ئەو گوڵشەنەو نوخشەو ئەمامی ئەو چەمەنە کە دەستم خامەی ئاشنایی گرت‌و چاوم بەنامەی رۆشنایی هەڵێنا، ئاوبەناو مەیلی سروشتیم‌و ئارەزوی زگماکم بەمتالای کتێبان دەبزوت.. ) (ل11).

-4-

### شوکردنی

مەستورە داستانی شوکردنی خۆی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە

(بەڵام لەبەرایی فەرمانڕەوایی‌دا (مەبەستی فەرمانڕەوایی خەسرەوخانی ناکامە) لەبەر کەم ئەزمونی توشی چەند هەڵەیێ هات: باپیرو باوك‌و مامەکانی نوسیاری ئەم کتێبەی بەبێ تاوان کۆت‌و زنجیر کردو زۆر بەبێ بەزەییانەو رەفتارێکی دزێوەوە سێ هەزار تمەنی بەناوی باجەوە لێ سەندن، سەرەنجام خودا کردی بەوئیهادی‌و دڵپیسی بەدکارانی بۆ ئاشکرابوو لەدوی ناردن‌و



به‌خه‌ڵاتی گرانبایی و شایان سه‌ربه‌رزی کردن.) (ل198–199)

خه‌سره‌وخان به‌وه وازی لێ نه‌هێناون، به‌ده‌وڵه‌مه‌نی زانیون و لای وابوه جگه له‌سامانه‌که‌ی خۆیان، سامان و دارایی حوسه‌ینقوڵی خانی باوکبرایشی له‌لای ئه‌مان حه‌شار دراوه، بۆئه‌وه‌ی سامانه‌که‌یان زه‌وت بکا، گێچه‌ڵێکی تری پێ کردون، له‌م باره‌یه‌وه مه‌ستوره نوسیویێتی:

(له‌به‌رئه‌وه‌ی حوسه‌ینقولیخان زۆربه‌ی سامان و نه‌ختینه‌کانی له‌کن بنه‌ماڵه‌که‌ی منی که‌مینه دانابوو، نێو براو سه‌باره‌ت به‌وه که له‌باوکمه‌وه پوورزایشم بو، کاربه‌ده‌ستانی والی بۆ باوکمیان تێ چاندبوو له‌داستانه‌که‌یانه‌وه وه‌رداو له‌و کاره‌وه‌یان گلاندو ئه‌وه‌یان کرد به‌بیانو، ئه‌و سامان و نه‌ختینه‌یه‌ش که هه‌مان بو لێمان داگیرکه‌ن و ئه‌ویش بخه‌نه سه‌ر گه‌نجینه. به‌م مه‌به‌سته حوسه‌ینقولیخانیان فریوداو به‌ڵێنی فه‌رمانڕه‌وایی ئیسفه‌ندئابادیان دایێ و ئه‌میش هێشتا ساردی و گه‌رمی و تاڵی و سوێری ژیانی بۆ که‌س تاسه‌ر نه‌ماوی نه‌چێژتبو، به‌ته‌ماحی فه‌رمانڕه‌واییه‌وه پشتی له‌مافی خاڵۆو خوارزایی هه‌ڵکردو پاشان به‌بیانوی به‌سه‌رکردنه‌وه‌ی یه‌کێ له‌ئامۆزاکانمان که نه‌خۆش که‌وت بو له‌دوای باوکی نارد، هه‌رکه باوکم گه‌یشته ئه‌وێ، حوسه‌ینقولیخان کۆڕێکی به‌ست و له‌دژی والی ده‌ستیان به‌وتووێژکرد، به‌ڵام له‌ده‌ره‌وه چه‌ند که‌سێکی له‌پشت په‌رده‌وه لێ ڕاگرت بون گوێ یان له هه‌مو که‌ین و به‌ینه گرت بو. ئه‌و شه‌وه بۆ سبه‌ینێ محه‌مه‌د به‌گ و مسته‌فا به‌گ کوڕانی فه‌تح عه‌لی به‌گی وه‌کیل و ئه‌کبه‌ر به‌گ که ببو به‌مایه‌ی ئه‌م هه‌نگامه‌یه و سوڵتانی کوڕی ئه‌زه‌ر عه‌لی به‌گ و ئه‌بولحه‌سه‌ن به‌گ، باوکی ئه‌م که‌مینه‌یه و مام و ئامۆزاکانی دیکه سه‌رله‌به‌ر فه‌رمانی کۆت و زنجیرکردن و زیندان کردنیان دراو هه‌موویان گیران و به‌کۆت و زنجیرکراوییه‌وه زیندان کران. پاش چه‌نانێ فه‌تحعه‌لی به‌گ و سوڵتانیان له‌قه‌ڵای قه‌سلان دا کوشت. ئه‌کبه‌ریش به‌هه‌زار ته‌ڵه‌که‌و ده‌هۆ، ساهه‌رچۆنێ بو، سه‌ری خۆی رزگارکرد، مامی ئه‌م که‌مینه‌یه‌یش، چونکه هیچ تاوانێکی نه‌بو، ئازادکراو به‌به‌زه‌یی و دڵاواییه‌کی زۆره‌وه خه‌ڵات کراو ئه‌وه‌بو بۆ پته‌وکردن و چه‌سپاندنی نێوان ته‌بایی و نێوان کۆکی، له‌ئه‌نجامدا به‌ندو به‌نده‌واری هاوسه‌ریم له‌گه‌ڵ خوسره‌وخان دا سه‌روبه‌ر نراو به‌وپه‌ڕی شان و شکۆوه پێم هاویشته حه‌ره‌مسه‌راوه.) (ل201–202).

ره‌نگه له‌و سه‌رده‌مه‌دا زۆر کچی سنه‌یی خه‌وی به‌وه‌وه دیبێ ببێته هاوسه‌ری گه‌وره‌ترین ده‌سه‌ڵاتداری ناوچه‌که: والی کوردستان، که هێشتا له‌ناوه‌ڕاستی سییه‌کانی ته‌مه‌نی دابو، به‌ڵام ئه‌م شوکردنه جۆرێ بوه له‌سه‌ودای سیاسی و کۆمه‌ڵایه‌تی له‌نێوان والی زۆردارو بنه‌ماڵه‌ی قادریی زۆرلێکراودا، بنه‌ماڵه‌ی قادری کچه‌که‌یان له‌نرخی‌دا داوه.

ئه‌گه‌ر له 1220دا له‌دایك بوبێ، وه‌کو له (تحفه: 322) تێ ئه‌گه‌ین و له 1244دا شوی به خه‌سره‌وخان کردبێ، وه‌کو مه‌ردۆخ ئه‌ڵێ، ئه‌وا ئه‌بێ به 24ساڵی به‌بوکی بۆ حه‌ره‌مسه‌را برابێ.

خه‌سره‌وخان له‌ژیانی تایبه‌تی خۆیدا پیاوێکی بێ به‌ندوبار بوه، له‌م باره‌یه‌وه (مه‌ستوره: 198) ئه‌ڵێ: (زۆری حه‌ز له‌رابواردن و خۆش گوزه‌رانی ده‌کرد، ده‌نگی ئاره‌زوی رابواردن و خۆش گوزه‌راندنی ئه‌م پیاوه، داستانی بارامی گۆڕی له‌بیری خه‌ڵکی بردبوه‌وه..).

(بابانی- 71) ئه‌ڵێ: (رۆژانی ژیانی به‌(خواردنه‌وه‌ی مه‌ی و موعاشه‌ره‌تی ژنانی زیوئه‌ندام) به‌سه‌رئه‌برد، ئه‌م ره‌فتاره کاری له‌دانیشتوانی سنه‌یش کردوه (به مقاد الناس علی دين ملوکهم) هه‌مو ئه‌عیانی کوردستان به‌خوارنه‌وه‌ی پێکی ده‌ماده‌مو هاونشینیی روسپیانی سۆزانییه‌وه خه‌ریك بون.)

(تحفه: 203) ئه‌ڵێ: (ئاره‌زوویه‌کی له‌ئه‌ندازه به‌ده‌ری له‌ژیان و رابواردن هه‌بو، هه‌مو شه‌وێ چل گۆرانیبێژو مۆسیقاژه‌نی ژن و پیاو له‌مه‌جلیسه‌که‌ی‌دا ئاماده ئه‌بون).

خوسره‌وخان، کاتی خۆی به‌رابواردن له‌گه‌ڵ ژنانی جوان و خواردنه‌وه‌ی زۆری مه‌ی به‌سه‌ر بردوه، له‌ئه‌نجامی ئه‌مه‌یش دا نه‌خۆش که‌وتوه، وه‌ك (بابانی: 72) ئه‌ڵێ :(به‌هۆی زیاده‌ڕه‌وی له‌خواردنه‌وه‌ی مه‌ی‌دا توشی ماخۆلان بو)، یان وه‌ك (مه‌ستوره: 203)ی هاوسه‌ری ئه‌ڵێ : (توشی نه‌خۆشی جه‌رگ بو). له‌هه‌ردو حاڵه‌ت دا ئه‌لکهول ئه‌بێ هۆی سه‌ره‌کی نه‌خۆشیه‌که‌ی و ئینجا




مردنی‌بێ. له 2ی ره‌بیعی ئه‌وه‌ڵی 1250دا له‌ته‌مه‌نی 29ساڵی‌دا مردو مه‌ستوره‌یش به‌گه‌نجی بێوه‌ژن که‌وت. (مه‌ستوره: 204) مه‌ستوره له‌خه‌سره‌وخان منداڵی نه‌بوه، شوی تریشی نه‌کردۆته‌وه، به‌ڵام هه‌وێکه‌ی حوسنی جیهان، 3کوڕو 3کچی هه‌بوه، پێ ئه‌چی تاشیرازه‌ی ئه‌م خێزانه به‌ته‌واوی هه‌ڵوه‌شاوه، مه‌ستوره له‌گه‌ڵ ئه‌م بنه‌ماڵه‌یه‌دا ژیابێ.

-5-

## کۆچی بۆ سلێمانی و مردنی

ساڵانی (1250–1264) که به‌بێوه‌ژنی به‌سه‌ربردوه، له‌ژیانی مه‌ستوره‌دا ساڵانی کامڵبون و پڕشتی زۆرو به‌رهه‌می گرانبه‌ها بون، هه‌ر له‌و ماوه‌یه‌شدا بوه (تاريخ اردلان)ی ته‌واوکردوه.

دوای مردنی خه‌سره‌و خان، ئه‌رده‌لان له‌ناو گه‌رده‌لولی ئاکۆکیی ناوخۆی ئه‌میره‌کانی ئه‌رده‌لان دا ئاسایشی بیرو ژیان و سامانی تێ‌دا نه‌ماوه، حوسنی

جیهان‌و توباخانی بوکی، جوته برا: ڕەضا قولیخان‌و ئەمانوڵلاخان، مامەکانیان: محەمەد صادق خان، عەباسقولیخان. نەك بەزەییان بەدانیشتوانی وڵاتەکەدا نەئەهاتەوە، بەڵکو بەزەییان بەیەکتریشدا نەئەهاتەوە، لەسەر دەسەڵات‌و پارە خەریك بون یەکتریان ئەهاڕی‌و لەگەڵ خۆیان دەسەڵاتی دێرینەی بنەماڵەی ئەردەڵانیشیان بەرەو کوێربونەوە ئەبرد.

دوای ئەوەی ڕەضاقولیخان‌و ئەمانوڵلاخانی برای چەندجارێ لەلای دەربای قاجار ملی یەکتریان شکاند، دەرباری قاجار بۆئەوەی ئاسایش‌و دەسەڵات بگێڕێتەوە بۆ ناوچەکە، کەوتە سەرپێری دانانی حاکمێك لەدەرەوەی بنەماڵەی ئەردەڵان. خەسرەوخانی گورجییان داناو، بەگەیشتنی حاکمی نوێ هەر لەرێگاوە ڕەضاقولیخانی بەزنجیرکراوی ڕەوانەی تاران کرد، دەستوپێوەندەکانی هەردوبرا: (ڕەضا قولیخان‌و ئەمانوڵلاخان) پەرەوازەبوون، هەندێکیان بەکۆمەڵ ڕوویان لەشارەزوورو سلێمانی کرد، مەستورە لەم بارەیەوە نوسیویەتی:

(لەبەرەوەتر باسمان کرد، کاتێ کە خوسرەو خانی گورجی (ئەرمەنی) گەیشتە ناوچەی کوردستان‌و بەبەڵێن‌و سوێندی فراوان، ڕەضاقولیخانی هەڵفریواندو بەلای خۆی‌دای ڕاکێشا، محەممەد سوڵتان‌خان‌و سەرلەبەری پیاوماقوڵانی ویلایەتی ئەردەڵان ماڵ‌و ژن‌و منداڵی والی‌و زۆربەی خەڵکی ئەردەڵانیان بەرەو هەورامان کۆچداو لەو کاتەدا من نوسیاری ئەم دێڕانە یەکێ لەو کۆچ کردوانە بوم. هەر کە گەیشتینە شوێنێ کە ناوی هۆشبارانیە، حەسەن سوڵتانێ هەورامی بەپیری کۆچکردوانەوە هات‌و بەشێوەیەك کە شایانی پلەو پایەیان بێ ڕێ‌و ڕەسمی پێشواز لێ کردنیانی بەجێ هێنا.

لەو دەمەدا خان ئەحمەدخان کە لەگەڵ والی‌دا دو ڕێ نێو یەك قەپیلك‌و ئەستێرەی یەك بورج بون، فەرمانڕەوای مەریوان بو، سەبارەت بەوەی کەوالی لەگەڵیدا نێوانیان خۆش نەبو، ئەمەی بەهەل زانی‌و بەرەو ناوچەی هەورامان هات‌و مرخی لەگرتنی کۆچ کردوەکان خۆش کردبو، بەڵام هەر کەدیتی خەڵکەکە بەجاری دەستیان لەگیانی خۆیان شوشتوەو هەروا بەئاسانی خۆیان بەدەستەوەنادەن، لەوکارە کشایەوە.

ئەو شەوە کۆچ کردوەکان کە لەهەزار کەس زیاتربون، لەگوندی هۆشبارانیان بەسەربرد، بۆ سبەینێ کەهێشتا ڕۆژ هەڵنەهاتبو بنەو باریان راداو لەرێگەیەکی ناهەموارو سەختەوە، کە هەڵۆی بەسەردا فڕیبا پەڕی دەوەری‌و مانگی‌پێ سوکی ئاسمانی لێوە تێ‌پەڕی‌با دەکەوتەخواری بۆنێو کەندەلان‌و هەڵدێری پەستی‌و هەپرون بەهەپرون دەبو، تێ‌پەڕین‌و بەگوندێ لەگوندەکانی شارەزور گەیشتن، کەنێوی سەرگەتەو لەوێ لێی گیرسانەوە. ئینجا لەوێوە محەممەد سوڵتان‌و میرزا عەبدوڵلای مونشی باشی چون بۆ سلێمانی‌و بەخزمەت عەبدوڵلا پاشای بابان گەیشتن‌و ڕێ‌و ڕەسمی پێشواز ]، کردنیانی بەجێ گەیاندو پیاوماقوڵێکی لەتەکیان دا نارد بۆ ناوچەی شارەزور، بۆئەوەی ئەو خەڵکە بەسەر گوندەکانی شارەزوردا ببەشرێنەوەو داین بکرێن.

لەباسی خونچەی باخی خوسرەوانی، نوێباوەی بیسارانی کامەرانی، ئەمانوڵلاخانی ثانی دا لەبیرمانکرد لەوە بدوێین کە لەوکاتەدا دڵسۆزانی گیانفیدای ئەو زاتە هەر دەستەیەکیان کەوتنە وڵاتێکەوەو هەر بڕێکیان لەبنارێکدا گیرسانەوە، حوسەینقولیخانی مامی ئەمانوڵلاخان کەپورزای من، نوسیاری ئەم کتێبەش بو، ڕوی لەسلێمانی کردو بەوپەڕی ڕێزەوە لەوێ پێشوازی لێکراو گیرسایەوەو کاتێکیش هەواڵی کۆچی ئێمەی بیستەوە خەڵکێکی زۆری بەئەسپ‌و هێسترەوە نارد. سەد کەسێ لەبنەماڵەی ئێمە بگوێزنەوەو لەلایەن خۆیشیەوە جێگەی هێورین‌و گوزەرانی بۆ ئامادەکردین‌و هەریەکەی بەپێ‌ی پێداویستی خۆی کۆمەگ‌و یارمەتی دەداو لەخزمەتیدا کاتمان بەخۆشی بەسەردەبرد، بەڵام پاش چەنانێ، چارەنوسی خودا لەخۆش



گوزەرانی ئێمە رازی نەبو، ئەوەبو لەرۆژی 14ی مانگی زیلحیجەی 1264ك (1846/11/23ز)دا جەنابی حوسەینقولیخان نەخۆشی بەسەریدا زاڵ بو، لەماوەی شەوو رۆژێکدا گیانی بەبەهەشتی بەرین شادبوو لەپرسەکەیدا هەزاران سینەی بۆ هەڵ دڕان و منی مەستورەی سەر ئێ شێواوو دەربەدەریش لەدووری لێك دابڕانی ئەو گیانە نازیزەم دوسێ رۆژێکە لەشو رۆحم بەبەڵای تای نەخۆشییەوە دەتلێتەوە. بزانین خودا چیمان بەسەردێنێ و ئارەزووی بەچیە..) (ل236-238).

مەستورە بەو چەند دێرەکۆتایی بەمێژوەکەی هێناوە، چونکە ئەویش هەر لەو رۆژانەدا بەپێی (حدیقە: (321-322) لە 1264دا لەتەمەنی 44ساڵیدا بەهەمان دەرد کۆچی دوایی کردوە.

-6-

**بەرهەمەکانی**

پێ ئەچێ ماهشەرەف خانم بەدانانی شیعر دەستی پێ کردبێ، لەدەرگای شیعرەوە چۆتە ناو دنیای نوسینەوەو، (مەستورە)ی هەڵبژاردوە بەنازناوی خۆی. (دیوان مەستورە کردستانی) سێ جار چاپ کراوە:

جاری یەکەم: ساڵی 1304 هیجری شەمسی، لەسنە، لەلایەن حاجی یحیی معرفت کردستانی‌یەوە چاپ و بلاوکراوەتەوە.

جاری دوەم، ساڵی 1362 هـ.ش، لەتاران نشرما، لەلایەن دیوان احمد کرمی-یەوە.

جاری سێیەم، بەهاری 77، لەتاران انتشارات امیربهادر، لەلایەن دکتر صدیق صفی زادە (بورەکەئی)یەوە.

شیعرەکانی ناو چاپی یەکەم و دوەمی دیوانەکەی فارسین، بەڵام چاپەکەی صەفی زادە جگە لەشیعرە فارسیەکانی 462 بەیتی کوردی تێدایە، زۆری شیعرە کوردیەکانی بەهەورامی هۆنیوەتەوەو، بەزۆری شیوەنی بەکوڵن بۆ مەرگی خ ٍسرەوخانی ناکامی مێردی. هەندێ شیعری تریشی بەپاڵ دراوە، کە بەکرمانجی خوارو هۆنراونەتەوە، بەزمانەکەی و جۆری داڕشتنی‌دا لەشیعری ئەو ناچن.

بەقسەی (صفی زادە: 16) دو کتێبی تریشی نوسیوە: (مجمع الادباء) کە بیۆگرافی شاعیرانی کوردەو (رسالەی شرعیات) کەباسی بنچینەکانی عەقایدو ئەحکامی ئیسلام ئەکا.

(مجمع الادباء)ی جاری لەبەردەستدا نیەو، کتێبەکەی تریشی لەژێرناوی (عقائد) ساڵی 199 لەستۆکهۆلم (سوید) لەلایەن عەبدوڵڵای مەردوخەوە بەپێشەکی و لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلەوە بلاوکراوەتەوە.

لێرەدا من خۆم لەقەرەی شیعرەکانی نادەم، ئەوە بەجێ ئەهێڵم بۆ شارەزایانی مەیدانی ئەدەب براو کتێبەکەی تریشی بەجێی ئەهێڵم بۆ خەڵکی کە ئەوەی من مەبەستمە کتێبە مێژووییەکەیەتی (تاریخ اردلان).

(تاریخ اردلان)ی (مستورە کردستانی) بەهیمەتی (ناصر ازادپور) ساڵی 1343هـ.ش لە(چاپخانە بەهرامی) لەسنە چاپ کراوە.

د. حەسەن جاف و شکور مستەفا لەژێرناوی مەستورەی کوردستانی (مێژووی ئەردەلان) دا کردوویانە بەکوردی، ساڵی 1989 لەبەغداد لەلایەن (دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی)یەوە بلاوکراوەتەوە.

3-کەمایەتی لەم وەرگێرانەدا هەیە:

1-زمانەکەی: ئەگەرچی وەرگێرەکانی شکورد مستەفا کەرکوکی و د. حەسەن جاف گەرمیانیە، بەلام لەنوسینەکەیاندا زمانە رەوان و باوەکەی کوردستانی عیراقیان بەکارنەهێناوە، بەڵکو زۆریان لەخۆیان کردووە بۆ ئەوەی لاسایی زمانەکەی (شەرەفنامە)ی هەژاری موکریانی بکەنەوە، لەم کارەدا سەرکەوتوو نەبون، زمانەکەیان بۆ خوێندنەوە ناقۆڵا و بۆ تێگەیشتن سەختە.

2-وەرگێرانەکەی: لەهەندێ شوێندا بەوردی تەرجومە نەکراوەو، لەهەندێ جێگەیشدا رستەی گرنگی لێ قرتاوە، ئاخۆ هۆی ئەم ناتەواویە نوسینەوەو چاپ کردنێتی، یان وەرگێرەکان بەئەنقەست ئەو رستانەیان لێ دەرهێناوە دیارنیە.



3-چاپەکەی: هەڵەی چاپی زۆری تێکەوتوە، هەندێ لەساڵەکانیشی کە لەئەسڵی فارسیەکەی‌دا بەراستی نوسراون، لێرەدا تێکچون. لاپەرە 85یشی ناتە اوە چونکە بەهەڵە لەکاتی چاپدا، لاپەرەی 58ی خراوەتە جێگەی.

-7-

**سەرچاوەکانی**

مەستورە خۆی دەربارەی هۆی دانانی (تاریخ اردلان) و جۆری سەرچاوەکانی ئەڵێ:

(تاڕۆژێکیان رێم کەوتەدیوانەکانی پێشینان و تۆمارو بەیازی پاشینان مێژوونێکم لە کوردان و دەستاوێژێکم لەنیشتمانەکەم بەرچاو کەوت، پاش



موتالاو دوای نامە گۆڕینەوە، تەماشام کردو خوێندیشمەوە کە شەرحێکیان لەمەڕ چۆنێتی حالّو بالّی فەرمانڕەوایانی کوردستان نوسیوە، بەلاّم بەهۆی ئەوەی کە کورتەیێك لەمانەی ماونەوە دوڕی نەسمراو بو، متی کەمینە کە کەمترین دارخورمای گوڵشەنی ئەم گوڵزارە وەك ئێرەم بنیاتنراوە. بەسروشتی بلێسەدارو زەینی رەخنەگرانەوە بەدوی دریژەپێدانەوە چونم بەپێویست زانی و پەرژامە سەر نوسینی ° م چەند دێرەو دەنگوباسی پاشە ،ڵۆو بەخێروخۆشی و بەختەوەری گوز رێتی زنجیرەی پایەبلّندی بەنی ئەردەلاّنم بەبەشێك کە لەمێژوم هەڵێنجاو ـ ەپێشینانم بیستووەو بەرچاوی منی کەمینە کەوتوە) لەم نوسخەیەدا رون سردۆتەوەو لەخوێنەرەوە چاوەڕوانی نزای چاکەم.) (ل11-12).

بەم پێیە سەرچاوەکانی بریتی‌بون لەنوسراو و باس و بابەتی بیستراوو بینینەکانی خۆی:

### 1-نوسراوەکان

گرنگترینی سەرچاوە نوسراوەکانی مەستورە، مێژوەکەی مەلا محەمەد شەریفی قازی: (زبدە التواریخ) و، خوسرەو کوڕی محەمەدی کوڕی مەنەچۆری ئەردەلان: (لب التواریخ)ە، مەستورە کتێبەکەی خوسرەو بەگ بە (تاریخ الاکراد) ناونەبا.

مەستورە لەکتێبەکەیدا لەلاپەڕەکانی: (26و28و29و49و58و83و93و98و106) پەنجەی بۆ کتێبەکانی قازی شەریف و خوسرەو بەگ راکێشاوە، هەندێ جار گێڕانەوەی هەواڵەکان، کە لەگەڵ یەکتری جیاوازن، بەیارمەتی ئەم دوو سەرچاوەیە، لەگەڵ یەك بەراوردو تاووتوێ ئەکا، بەلاّم ناوی (ذیل شەرەفنامە) نابا، رەنگە هۆی ئەمەیش ئەوەبێ کە لەبەردەستیدا نەبووبێ.

بێگومان (شەرەفنامە) ئەگەرچی ئەو بەناو ناوی نەهێناوە، سەرچاوەیەکی گرنگی‌تری ئەم مێژوە بوە. هەروەها ئەبێ کەڵکی لەمێژوە باوەکانی ئێران و ئەو نامەو بەڵگانەیش وەرگرتبێ کە لەکتێبخانە ئاوەدانەکانی میرەکانی ئەردەلاّن داهەبون.

### 2-بیستنەکانی

بنەماڵەی مەستورە لەگەڵ میرەکانی ئەردەلاّن تێکەلاّوبون، ئەنکی هاوسەری خوسرەوخان و خوشکێکی باوکی هاوسەری ئەمانوڵلاّخان و خۆیشی هاوسەری خوسرەوخانی ناکام بوە. باووباپیریشی بەشێ بون لەداودەزگای بەڕێوەبەرایەتی ئەردەلاّن و لەشەڕو شۆڕەکاندا بەشداربون. زۆرجار روداوو چیرۆکی ئەم بنەماڵەیە کە نەنوسراوەتەوە لەناو خۆیان دا دەماودەم گێڕاویانەتەوە. لەم بارەیەوە ئەو هەلەی بۆ مەستورە هەڵکەوتوە، رەنگە بۆ مێژونوسەکانی‌تر هەڵنەکەوتبێ.

مەستورە، بۆ سەلماندنی یەکێ لەبۆچونەکانی دەڵێ: (.. بەلاّم بەندەی کەمینە لەگەڵ رای یەکەم دام، چونکە ئەنکم یەکێ بوە لەوانەی کە لەباوەشی ئەو بنەماڵە بەرزەدا پێ گەییوەو هاوسەری والی بلێند نژاد، خوسرەوخانی باوکی ئەمانوڵلاّخان بو، گۆڕیان پڕلەنور ، دەربارەی سەردەمی منالّیی خۆی، بەتایبەت لەو سەروبەندەدا کە بنەماڵەکەیان لەهەمەدان بو، زۆری سەرگوزشتە بۆ دەگێڕامەوە.. ) (ل107).

لەشوێنێکی‌تردا ئەڵێ (.. هەرچەندە لەکتێبان دا بەرچاو نەکەوتوە، بەلاّم وەك لەبەرینانم بیستوە..) (ل34).

لەجێگەیەکی تردا ئەڵێ : (.. وێڕای ئەوەی کە مێژو لەم بارەوە زۆری لەسەر نەڕۆیشتوە، بەلاّم وەك لەپێشینانم بیستوە دوای نیشان کردنی زەڕین کولاە ئەو گەوهەرە گرانبایییە ئەختەر بلێندە بەهاوسەریی خان ئەحمەدخان قایل نەبو..)(ل45).

ئەمانەیش چەن نمونەیەکی کەن:

(دەگێڕنەوە: ئەو دەسکەوتەی لەلەشکرەکەی ئیسماعیل خان وەگیر باپیرم کەوبو زۆر لەخۆی بەزیاتر دیت، لەبەرئەوە بردمیە خزمەتی خوسرەوخان، بەلاّم ئەو فەرمانڕەوا دادگەرە، بەو هیمەتە حاتەمی یەوەی کە هەی‌بو توخنی هیچ نەکەوت و سەرلەبەری بەرەو روی خۆی کردەوە، تەنانەت ئاوێنەیێکی گرانبایی زۆر نایاب لەو دەسکەوتە تائێستا بەموفەرك لەبنەماڵەی ئێمەدا هەر ماوەتەوە) (ل157).

میرزا لوتفوڵلای کوڕی میرزا عەبدوڵلای وەزیر کە مامی ڕاستەقینەی دایکی ئەم کەمینەیەیە، لەو شەڕەدا حەڤدە کەسی لەسەر زینی ئەسپ گلاندو لەخوێنی خۆیانی‌دا گەوزاندن و بەم ڕەنگە ئازایەتی و مەردایەتی خۆی ئیسپات کرد) (ل160).

(باپیرە گەورەم کە دەرامەتی عەباسقولیخان و والی شۆشتەری پێ سپێردرابو، هەزار تمەنی وەگیر کەوت.) (ل162).

(باپیری سەروەری ئەم کەمینەیە، لەو هەراو هوریایەدا لەگەڵ ناڕازییەکان‌دا هاودەست بو، لەبەرئەوەی ئەمامی پەنا سێبەری پەروەردەی ئەو بنەماڵەیە بو، بێ‌نمەکی کردبو، دەستی لەگەڵ دژمنانی تێکەڵ کردبو، چەند ڕۆژێ بۆ گوێ ڕاکێشان، چاوی بەزەیی لێ پۆشی و پێنج هەزار تمەنی چاوترسێنانە لێ سەند، بەڵام پاش 18 ڕۆژ دوبارە پلەی چاودێری‌کردنی پێ‌بەخشیەوە.) (ل174).

(عەبدوڕەحمان پاشا جێگەی خۆی گرتەوەو دەسەڵاتی پەیداکردەوە، ئەمانوڵلاخانیش بەسەرکەوتنەوە گەڕایەوە بۆ مەڵبەندی خۆی و کەهیەی بەغدای لەگەڵ دوو سەت لەبەدیل گیراوانی ڕۆمی‌دا کە لەم شەڕەدا بەدیل گیرابون لەگەڵ محەممەد ئاغای باپیرەی ئەم کەمینەیەدا نارد بۆ خزمەت فەتحعەلی شا، بەڵام شا ناردنیەوە بەغدا) (ل179).

(بەنیازی لابردنی والی‌یەوە ڕویان کردە دەرباری تاران و هەر ئەو شەوە بۆ بەیانی کە ئەم هەواڵە بەوالی گەیشت محەممەد ئاغای سەرکاری کە باپیری پایەبڵیندی نوسیاری ئەم مێژوەیە، بۆ ڕونکردنەوەی ڕاستی کەین و بەینەکەو بەتاڵ کردنەوەی نیازی پیسی ناڕەزایان، نارد بۆ دەرباری فەتحعەلی شا..) (ل184).

(خەبەری سەرکەوتنیشی بەشەڕو هەراکەی بانەدا.. پێ گەیشت، محەممەد ئاغای باپیری سەروەری ئەم نوسیارە، بەرانبەر ئەم خزمەتە گەورەیە بەجوبەیێکی تورمەو شیرێکی دەبان خەڵات کرد..)(ل187).

(شا لەم بارەیەوە تابلێی خەمبار بو، تەنانەت ناڕەزایی و نەفرینی خۆی بەمحەممەد ئاغا، باپیرەی نوسیاری ئەم کتێبە، کە ئەمانوڵلاخان بەناوی باڵیۆزەوەی ناردبو بۆ دەرباری قاجار بەئەمانوڵلاخان ڕاگەیاند..) (ل188).

(نزیکەی سەت هەزار تمەنێ بۆ سەروبەرنانی ئەم شایی و ژن هێنانە خەرج کرا. لەم سەت هەزار تمەنە، چل هەزار تمەنی بۆ ئالاو والا و بۆ زەک و دۆزەک و خشڵ و زێڕ زیوی بوکێ خەرج کرا، خوالێخۆشبو باوکم بۆخۆی سەرپەرشتی ئەم زەماوەندەی کردوەو هەر خەرج و پول و دراوێکی بۆ شیرینی و خواردەمەنی خەرج کراوە ئەو سەرپەرشتی بوە. دەگێڕنەوە: لەم شاییەدا دە هۆڕ نوقل لەگەڵ چەند تێڕ قەندو ئەباتی سپی و چەند شیرینییەکی‌تر بەخەرج دراوە، ئیتر ئەو دواکەیشی هەر بەم پێودانە بوەو دەبێ هەرواش لەقەڵەم بدرێ) (ل189).

## 3-بینینەکانی

مەستورە ئافرەتێکی زرنگ و وریابوە، هەر لەمناڵیەوە خوێندویەتی و سەودای خوێندنەوەو نوسین لەکەللەی داوە، لەناو بنەماڵەیەکی ناسراوو دەوڵەمەن و ڕۆشنبیردا پێ‌گەیشتوە. بەچاوێکی تیژ سەیری ڕوداوەکانی دەوروپشتی و چاودێری هەلومەرجی وڵاتی کردوە، کەچۆتە ناو حەرەمسەرای خوسرەوخانەوە، ئەم بوارەی زیاتر بۆ فراوان بوە. بۆنەوەی لەنزیکەوە ئاگای لەهەواڵ و دەنگوباس و ڕوداوەکان بێ و زیاتر تێکەڵاوبێ لەگەڵ دەسەڵاتدارانی وڵات.



(.. من ئەم کەمینەیە، بەچاوی خۆم دیتم باڵیۆزی روس و ئینگلیس لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمانوڵلاخانی والیدا بەناوی دیتنی ئەم قەڵایەوە بەسەر کوردستان (سنە)دا تێدەپەڕین و لەگەڵ ئەوەشدا کە قەڵاکە وێرانە بو، سەیرانی شوێنەوارو کەلاوەکانیان دەکرد..) (ل42).

(.. لەساڵی 1138ی ك داو لەو جێگایەی کە ئێستا باخێکەو نمونەی بەهەشتی بەرینەو نزیکی کۆشك و تەلاری مەرکەزی میرنشینەو بەفیردەوس بەناوبانگە، قوتابخانەیەکی بنیات ناو لەمەوداییێکی کورت دا پاشای بابان هەر کەموکوڕییەکی هەی بو، تەواوی کردو هێندەی دیکەی وەسەرناو منارەییێکی جوانی لێدروست کرد، تا سەردەمی فەرمانڕەوایی پڕ شانازی ئەمانوڵلاخانیش هەر مابو، من بۆخۆشم دیتم ئەمانوڵلاخان لەبەرئەوەی بونی ئەو منارەو ئاسەوارەی بەمایەی سەرشۆڕیی ئەردەلانەکان دەزانی، وێران و خاپوری کردو داری بەسەر بەردی‌یەوە نەهێشت.. ) (ل90).

ئەم دو روداوەی ئەیانگێڕێتەوە هی سەردەمێکن کە هێشتا مەستورە شوی بەخوسرەوخان نەکردوە، کەنیشانەی ئاگاداری زۆرو سەرنجدانی وردە، بێگومان دوای ئەوەی چۆتە ناو کۆشکی حکومڕانییەوە ئاسۆی دیتنەکانی، بەتایبەتی ئاگاداری لەروداوە سیاسیەکان فراوانتربوە.

-8-

مەستورە لەگێڕانەوەی باسێکدا ئەنوسێ: (ئەقڵی بێ خەوش و چێژو، سەلیقەی راست، ئەم قسەیە ناسەلمێنێ چونکە..) (ل15) ئەم سەرنجە ئەقڵی و رەخنەگرانەیە بۆ مێژونوس زۆر پێویستە بۆ ئەوەی ئەفسانەو روداوی هەڵبەستراو تێکەڵاوی روداوە راستەکانی مێژو نەکات. مەستورە وەکو یەکێ لەبنەماڵەی ئەردەلان لەباسەکانی دا بەلای ئەواندا دائەشکێنێ، بەڵام راستگۆییەکی زۆر لەنوسینەکانی‌دا هەیە، ئەو هەواڵانەی بەتەواوی لێیان دڵنیا نەبوبێ، گومانی خۆی لەراستیی و ناڕاستییان بەچەند رستەیەکی وەکو: خودا هەرخۆی لەراستی هەموشتێ ئاگادارە (ل15) خودا بۆخۆی دەزانێ (ل30، 50، 66) زانست لای خوایە (ل34) دەربڕیوە.

-9-

## رێبازی نوسینەکەی

مێژونوسانی کۆن، لەنوسینی ئەم بابەتانەدا دو رێبازیان گرتوە: یەکێکیان کەسەکانیان کردۆتە سەرباس لەژێر ناوی ئەواندا روداوەکانیان گێڕاوەتەوە، یان، ساڵ بەساڵ روداوەکانیان گێڕاوەتەوەو ساڵەکەیان کردۆتە سەرباس و باسی کەسایەتی و قارەمانی روداوەکانیان بەپێی ساڵەکانیان بەدوای یەکدا گێڕاوەتەوە، شەرەفخان لەنوسینی (شەرەفنامە)دا پێڕەوی رێبازی یەکەمی کردوە، هەمو مێژونوسەکانی ئەردەلانیش لەوانە مەستورە، لەرێبازی نوسین و گێڕانەوەی روداوەکانیان دا لاسایی شەرەفخانیان کردۆتەوەو بەچاولێکەری ئەو درێژەیان بەمێژوی ئەردەلان داوە، ئەگەر یەکێکیان یان زیادتر روداوەکانی ساڵانە بگێڕایەتەوە، بێگومان ئێستا کەرەستەیەکی زۆرتری لێکۆڵینەوەی مێژوی ئەردەلانمان لەبەردەستدا ئەبو، بەراوردکردنی روداوەکان ئاسانتر ئەبو.

زمانی نوسینی (تاریخ اردلان)و جۆری داڕشتنی، هەر ئەوانە ئەتوانن هەڵی بسەنگێنن کە شارەزای پەخشانی فارسین، ئەگەرچی سەجع و وشەی هاو واتاو درێژەدانی زۆری تێدایە، بەڵام بۆمن رەوان و تێگەیشتنی ئاسانە. مەستورە جگە لەوەی شارەزای مێژوبوە، لەچەندین جێگای گونجاودا ئایەتی قورئان، پەندی عەرەبی، شیعری فارسی هی خۆی و هی شاعیری‌تری تێکەڵاوی نوسینەکانی کردوە، ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە کە سەرچاوەی رۆشنبیریی مەستورە دەوڵەمەن بوە.



-10-

## هەڵسەنگاندنی

هەواڵەکانی (تاریخ اردلان) بەتایبەتی هەواڵەکانی پەنجا ساڵی دوایی دەربارەی: ناکۆکی ناوخۆی نێوان میرەکانی ئەردەلان و نێوان ئەردەلان و بابان و پەنابردن بۆ یەکتری و

هاندانی یەکتری بۆ شەڕو پەلاماری یەکتری.

زوڵم و زۆری والیەکانی ئەردەلان، بەتایبەتی لەروی کۆکردنەوەی زۆرەملیێ ی پارە، گرتن و ئەشکەنجەو کوشتنی ناڕەوا، دانان و لابردنی وەکیل و وەزیرەکان و کۆچی بەکۆمەڵ بۆ دەرەوەی ئەردەلان و نەمانی سەلامەتی سەرو سامان. بۆگەن بونی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی و خەریك بونی میرەکانی بەشایی و رابواردنی ژن و خواردنەوەو راووشکارو پێشکەش و بەرتیل.

گویێ نەدانە سکاڵا و گازندەی خەڵك، تەنانەت هی گەورەو دەسەڵاتدارەکان و سەرکوتکردنی بێ بەزەییانەی هەمو جۆرە ناڕەزاییەك

کارەساتی سروشتی، قاتوقڕی و برسێتی، رێبەندانی بەفرو سەرما، رشانەوەو نەخۆشیی تر.

ناکۆکی ناوخۆی میرەکانی ئەردەلان، کوڕەکانی ئەمانوڵڵاخان، خوسرەو خان، محەمەد سادق خان، حوسەینقولی خان، دوای ئەوانیش ناکۆکی ناوخۆی کوڕەکانی خوسرەوخان و ئەمانوڵڵاخانی دوەم.

دەسوەردانی ژنانی قاجار (حوسنی جیهانی کچی فتحەلی شا: هاوسەری خوسرەو خان و توبا خانمی کچی عەباس میرزاو خوشکی محەممەد شا: هاوسەری رەضاقولی خان) لەململانێی دەسەڵاتدا لەنێوان میرەکانی ئەردەلاندا.

لێکدانەوەی رووداوەکان مەستورە ئەگەیەنێتە ئەنجامگیرییەکی زۆر گرنگ دەربارەی پاشەڕۆژی میرایەتی ئەردەلان و پێشبینی تێکچوونی ئەکات و ئەنووسێت: (... ئیدی ئیدی و ئەختە ئەختە ئەم سەربزێوی و سەرسەختی و گویێ نەدانە بوو بەهۆی ئەوە شا پشتیان تێبکات و روویان لێ وەرگێڕێت و گوێیان راکێشێت، تەنانەت دەتوانین بڵێین شا هاتە سەر ئەو بڕیارە کەبناغەی ئەم بنەماڵەیە تێك بدات و داری بەسەر بەردیەوە نەهێڵێت). (ل231)

مەستورە کە لەقۆناغی داڕووخان و هەرەسهێنانی ژیانی سیاسی، کۆمەلایەتی، رۆشنبیری... میرایەتییەکانی ئەردەلان و باباندا ژیاوە، نزیکی داوودەزگای حوکمڕانی ئەردەلان بووە، بەچاوی خۆی رووداوەکانی بینیوەو گێڕانەوە جیاوازەکانی بیستووەو بەڵگەکانی خوێندووەتەوە، وەکو شایەتێکی ئاگادارو لێهاتووی سەردەمی خۆی، گێڕانەوەکانی لە(تأريخ اردلان)دا بۆ لێکدانەوەی مێژووی هەردوو ئەمارەتی ئەردەلان و بابان، نرخێکی گران و گرنگییەکی تایبەتییان هەیە.

-11-

## پلاری ژن

مەستورە لەناو رووداوەکانی سەردەمی خان ئەحمەد خاندا، گفتوگۆی ژنە بڵباسێك و خان ئەگێڕێتەوە، دووبارەکردنەوەی لێرەدا بێ جێ نییە

ئێلی بلباس لەخان ئەحمەد خان یاخی ئەبن، خان لەشکریان ئەباتە سەرو پەلاماریان ئەدا. هەردوولا بەشەڕ دێن. لەشکری ئەردەلان لەشکری بڵباس ئەشکێنێت. بڵباس ئەکشێتەوە شوێنێکی سەخت و عاسی. لەشکری ئەردەلان لەدوویان نابنەوە (مەستورە: 53-54).

لەسەری ئەڕواو ئەنووسێ؛ (چەند رۆژێ گەمارۆیان دان و رێی هاتوچۆو کاروباریان لێ بەستن تا بەم شێوەیە داوێنی دان بەخۆداگرتن و سەبریان لەدەست بدەن و واز لەلووتبەرزی بێنن و ملکەچی قبووڵ بکەن. ئەگەرچی دوایی، هێرشەکەیان راگرت، بەڵام ئەم رووداوە لەهەموو کانگای دڵیانەوە نەبوو. لەبەرئەوەی رێگای بەوێ گەیشتنی یەکجار سەخت و تووش بووبوو و بواری شەڕوشۆڕیان نەبوو، لەسەرویەرنا ی ئەم کارەدا سەریان سووڕما لەو دەشتەدا سەرگەردان مانەوە).

سەرەنجام رۆژێکیان کەڵەژنێکی جوانی ژیرو زیرەکی ئەو تیرەیە ئارەزووی گەشت سەیران دەکات. دە[illegible]بەری س[illegible] بێ سەنگەرو سوپەر بوو. رێکەوت تووش بوو بەتووشی کاربەدەستی خانەوە، لیی پرسی؛ (هۆی لێرە هەوارگرتنتان لەبەرچییەو ئەم هەموو خۆئامادەکردن و خۆسازدانە لەبەر کێیە؟) کاربەدەستەکە



لەوەڵامدا گوتی:(هۆی هەوارگرتنمان لێرە ئەوەیە رێگاوبان نییە و رێڕەوەکە زۆر تەنگەبەرەو بەئاسانی توانای لێوەدەربازبوونمان نییە).

ئەو ئافرەتە شەنگە بەتانوتو پلارێکی نازو عیشوەئامێزەوە، بوو بەباوەشێنی بڵێسەی ئاگری تووڕەیی و ڕکی خان. هەر دەمودەست فەرمانی ئامادەبوونی لەشکری سەرکەوتووی داو چیرۆکی ئەم ژنە نیهادپاکەی لەنوکەوە بۆ سەردارانی سوپا گێڕایەوە.

سەردارانی سوپاش دەستبەجێ دەستیان لەگیانی خۆیان شوشتو دەستیان بەقلفی توندوتۆڵی خوداوەندی دوو جیهانەوە گرتو لاوانی خەنجەر بەدەست بەتیغی ئاودارەوە چاکی ئازایەتییان لێ هەڵکردو دەستیان دایە شیرو رمو بەیارمەتی خودای بێهاوتا روویان کردە سەر لووتکەی چیاکانو لەو نشێوانەوە بەرەو هەورازان هەڵکشێنو دەروی شەڕوشۆڕیان لەڕووی دوژمنان هاویشتە سەر گازی پشت. ئەم تیرە چارە بەدە ئەم هەنگامەیەیان دیت دەسبەجێ دەستیان بەشەڕ کردو بەتەقەکردنو گابەرد گلۆرکردنەوەوە تێهەڵچوونو ئەو دلێرە رۆستەم ئاکارانە بەتیغو تیرو تەورەوە خۆیان گەیاندە سەنگەرە بەسامەکانیانو نێرو مێیان لەتیغ کێشانو پاشماوەیان ماڵو سامانیان بوو بەدەسکەوتی ئەو سوپا سەرکەوتووەو لەشکری زاڵبوو بەدیلو بەخسیرێکی زۆرەوە، لەوە زێتر پێوە نەچوو بەسەرکەوتنو زاڵبوونەوە گەڕایەوە...)

(ذیل شرفنامە) کە لە(تاریخ اردلان) کۆنترە ئەم باسەی تێدا نەنووسراوە، بەڵام پێش ئەم (لب: 54–55) هەمان چیرۆکی گێڕاوەتەوە، پێ ئەچێ مەستورەیش لەوی وەرگرتبێت، دوای ئەویش هەم لە(حدیقە: 131–132)و هەم لە(تحفە: 113)دا بەکەمێك دەستکارییەوە دووبارە نووسراوەتەوەو هەردووکیان شوێنەکەیان بەقەڵای رەواندز دیاری کردووە. ئەم چیرۆکە ئەگەر راستو رووداوبێت، یان خەیاڵو هەڵبەستراو، گێڕانەوەی لەلایەن مەستورەوە، بەو ئاشکرایی و بێپەردەیی یە، خۆی لەخۆیدا نیشانەی ئەوپەڕی ئازایەتی ئەدەبییە، بەتایبەتی بۆ ژنێکی چینی سەرەوەی کۆمەڵ، لەزەمانو زەمینی ئەوسای کوردستاندا. دوور نییە نالی ئەم گێڕانەوەیەی مەستورەی خوێندبێتەوەو هەر ئەمەیش هانی دابێت پڕکێشی بکات شیعرە بەناوبانگەکەی لەسەر هەمان رێڕەوی تەنگ بهۆنێتەوە.

-12-

## مەستورە لەبەر تیغی زماندا

دایکی رۆژگ نە پێش ئەوو نە دوای ئەویش، ژنێکی هەڵکەوتووی وەکو مەستوورەی بەمێژووی کورد نەبەخشیوە، بەڵام مەستورەیش وەکو هەمووکەسایەتییەکی هەڵکەوتووی کۆمەڵ، لەسەردەمی خۆیدا، کەوتووەتە بەر تیغی زمانو بەنووسراوی بەجێ ماوە. شیعرێکی درێژی نالی، گەورەترین شاعیری ئەو سەردەمەو کورتەلێدوانێکی فخر الکتاب، گەورەترین مێژوونووسی ئەو سەردەمەیە.



-13-

## نەشتەرەکەی نالی

مەستورە شاعیرێکی خاوەن دیوان بووە. بەقسەی (حدیقە: 321) نزیکەی 20هەزار بەیت و بەقسەی (تحفە: 209) زیاد لە 10هەزار بەیتی بەفارسی هۆنیوەتەوە. نالی لەباتی ئەوەی لەشیعرەکانی بکۆڵێتەوەو بەهرەی هونەری و شاعیرانەی هەڵبسەنگێنێت و بایەخ و نایەخی بەرهەمەکانی لەیەک جیا بکاتەوە، کەسایەتی خودی مەستورەی داوەتە بەر تیغی زمان و نەشتەری قەڵەم. نالی شیعرێکی 49بەیتی هۆنیوەتەوە، بۆ جوانکردن و رازاندنەوەی وەستاییەکی یەکجار زۆری تێدا بەخەرج داوە. کێش و قافیەی هەر 98 دێرەکەی وەکو یەک دارشتووە. لەشیعرەکەیدا خەو بەمەستورەوە دەبینێ و دەکەوێتە گێڕانەوەی:

مەستورە کە حەسنا و ئەدیبە بە حسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێک و عیتابێ!
هاتووم، وتی، عوقدەم هەیە، قەط مومکینە وابێ؟
هی تۆم ئەگەرەم مەسئەلە حەل کەی بەجەوابێ!

لێرە بەدواوە بەزمانی مەستورەوە 30بەیت هەڵئەبەستێ، بۆئەوەی نالی تاو بکاو ئارەزووی جووتبوونی لەلا بوروژێنێت، ستایشێکی جنسی کونوکەلەبەری ناو لنگی خۆی ئەکاو داوای لێدەکات لەگەڵی دروست ببێ و دوابەیتی ئەم تاوکردنە گەرمە، بەزمانی مەستورەوە، بەم پرسیارە ئەهێنێتەوە:

کێ بێ لەجیهاندا چ گەدا بێت و چ شا بێ
تەرکێکی وەها ناسک و پڕ لەذذەتی (....) بێ؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەی مەستورەدا، نالی بەزمانی چوکی خۆیەوە 13بەیت هەڵئەبەستێ و ئەڵێ:

دێوانە کە زانی کە دەبێ عوقدە گوشا بێ
هەستا و گوتی: ئەشکی رەوانم بەفیدا بێ!

لەشوێنێکی تریدا ئەڵێ:
کێ بێ وەکو تۆ بەم شەوە رەحمی بە منا بێ؟
مەجذوبە صیفەت، یەعنی صیلەی رەحمی تێدا بێ!
هەم جاذیبەو و قابیلەیی ئەخذو عەطا بێ
مەستورەو و مەخفی، شەبەهی بادی صەبا بێ!
مەستانە هەڵستێت و بەکوێریی روقەبا بێ!
ئەم باب زەنە گەرم و تەڕی کا بەکەبابێ! (دیوانی نالی: 603-630)

نالی، بێگومان لەم شیعرەدا مەبەستی ستایش و پەسنی مەستورە نییە، بەڵکو ئەم شیعرەی بۆ ئابڕووبردنی مەستورەو ئەتککردنی هەڵبەستووە. ئەبێ چی پاڵی بەنالییەوە نابێ سووکایەتی بەمەستورە بکا!

-ئارەزووی شێتانەی گەنجی و حەزلێکردنی سەرەڕۆیانەی سەردەمی فەقێیەتی نالی بووە لەسنە، ئەگەر وایە خۆ میرەکانی بابانیش لەسلێمانی هاوسەری جوان و کچی ج ـناسیان زۆر بووە، بۆچی نالی خەوی بەکەسیانەوە نەدیوەو ناوی ک ـیانی نەهێناوە؟

-یان ئەمیش (تێچێن)ێکە لەو ناکۆکییە درێژەی لەنێوان بنەماڵەی ئەردەڵان و باباندا هەبووە، بۆ شکاندنی یەکتری!

-یان حەسوودیبردن بەپایەی بڵندی ئەدەبی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی مەستورە؟ رەنگە هەر نالی خۆی بتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، نالیش نەماوە. ئەگەرچی نالی لەو سەردەمەدا بەمەبەستی جنێوپێدان باسی (سێکسیبوون)ی مەستورەی کردووە، بەڵام لەم سەردەمەدا گەورەترین ستایش بۆ ژنێکی ئینگلیز ئەوەیە پێی بڵێیت: (سێکسیترینی ژنان!).

-14-

## توانجەکەی فخر الکتاب

مەستورە لەدوای شەرەفخان، مەلامحەمەد شەریف، محەمەد ئیبراهی ئەردەڵانی و خوسرەو بەگی ئەردەڵان، پێنجەمین کەسە مێژووی ئەردەڵانی نووسیبێتەوە. فخر الکتاب چەندین ساڵ دوای مردنی ئەو ئینجا دەستی داوەتە نووسینی (تحفەی ناصری). بێگومان یەکێک لەسەرچاوەکانی (تحفە)، مێژووەکەی مەستورەو سەرچاوەیەکی تریشی (حدیقەی ناصری) عەلی ئەکبەری ئامۆزای بووە. بەراوردی (حدیقە)و (تحفە) دەریدەخەن، فخر الکتاب زۆری ئاگادارییەکانی لەم دوو سەرچاوەیە وەرگرتووە، تەنانەت هەندێ لەباسەکانی بەکەمێک دەستکارییەوە دەقاودەق لە(حدیقە) راگوێزاوە، کەچی فخر الکتاب لەباتی ئەوەی وەکو مێژوونووس بکەوێتە لێکۆڵینەوەی ناوەڕۆکی مێژووەکەی مەستورە، راستی و چەوتی گێڕانەوەکانی بخاتە سەر دەزگای هەڵسەنگاندن و رەخنە کەسایەتی خودی مەستورەی داوەتە بەر تیغی زمان و نەشتەری قەڵەم.

فخر الکتاب(تحفە: 209) ئەڵێت:

(مستورە یکی از نسوان طائفەی قادری و قدر بدصورت بودە ولی در طرائف معانی و ظرائف سخندانی و طرز غزل سرائی و قافیە ارائی اعجوبەی آن ایام و بخسرو خان ناکام عاشق بودە بوشاقت بیان و طلاقت زبان و غزلهای عاشقانە دلربائی از والی کردە و بهر شیوەو بهانە خود را بحبالەی نکاح خسرو خان دراوردە...)

لێرەدا چەند شتێک پێویستیان بەلێدوان هەیە:

1-بەپێی شیعرەکەی نالی ئەبێت مەستورە نەک (نەختێ بەدفەسال) نەبووبێت، بەڵکو ئەوەندە جوان و دڵرفێن بووە، پیاوی بەزەوقی وەکو نالی خەوی خۆشی پێوە بینیوە. نووسەر بۆ شکاندنی ئەم توانجەی تێگرتووە. تەنانەت ئەگەر جوانیش نەبووبێت، نابێت لێی بەعەیب بگیرێت، هیچ کەس جوانی و ناشیرینی بەدەست خۆی نییە.

2-وەکو ئەم ئەڵێت: مەستورە بەزۆر خۆی بەسەر خوسرەو خاندا ساغ کردووەتەوەو بەشیعرو قسەی جوان خوسرەو خانی راکێشاوەتە ناو داوی عەشقی خۆی و وای لێکردووە مارەی بکات و بیهێنێت. ئەگەر ئەم قسەیەی فخر الکتاب راست بێت، شایەتییەکی زۆر گەورەیە بۆ لێهاتوویی و زیرەکی مەستورەو کاریگەری ژن لەسەر پیاو، بەڵام مەخابن وەکو مەستورە خۆی ئەیگێڕێتەوە، ئەم وەکو قوربانییەکی داب ونەریتی دواکەوتووی کورد لەنرخی لێخۆشبوونی باوکی و خزمەکانیدا دراوە بەخوسرەو خان، نەک لەئەنجامی عەشق و دڵداریدا.

میرزا شوکروڵڵا، کەپشالوپشت میرزا بوون لەداوودەزگای میرەکانی ئەردەڵاندا، ناشێ لەم کەین وبەینە ئاگادار نەبوبێت، یان نەیبیستبێت، یان هیچ نەبێت (تاریخ اردلان)ی مەستورەی نەخوێندبێتەوە، کە بەئاشکرا باسەکەی گێڕاوەتەوە:

3-ستایشی وەستایی مەستورە دەکات لەشیعرو لەگفتوگۆدا، کەچی هیچ ئیشارەتێک بەمێژووەکەی نادات.

فخر الکتاب لەنووسینەکەیدا ب ـستی شکاندنی مەستورەو سووکایەتی پێکردنێتی. ئەبێت چی پاڵی بەفخر الکتابەوە نابێت سووکایەتی بەمەستورە بکات:

دوژمنایەتی بنەماڵەیی لەنێوان بنەماڵەی میرزا ش ـکروڵڵاو بنەماڵەی قادریدا؟

-یان حەسوودیبردن بەپلەی بڵندی ئەدەبی، رۆشنب ـی و کۆمەڵایەتی مەستورە؟

**سەرچاوە:**

لە پەراوێزی مێژووی ئەردەڵان دا.. چاپکراوی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم 1999.

چەند برگەیەکی تر لە کتێبی
لە پەراوێزی مێژووی ئەردەڵاندا

# محەمەد خان کوڕی خوسرەو خان
(1113-1105)

-1-

ئەگەرچی خوسرەو خانی باوکی بەفەرمانی شا سلێمان کوژرا بوو، بەڵام خۆی لەدەزگای صەفەویدا لە ئەصفەهان مابووەوە. شا سوڵتان حسێن، کەهاتە سەر تەخت، محەمەد خانی لەجێگەی خان ئەحمەد کرد بەوالیو رەوانەی کوردستانی کردەوە.

-2-

## بوژانەوەی میرایەتی بابان

لەسەردەمی ئەمدا، میرایەتی بابان، سەرلەنوێ بوژایەوەو وەکو هێزێکی کاریگەر لەڕووداوەکانی ناوچەکەدا هاتە مەیدانەوە، سلێمان بەبە، ناوچەکانی مەرگە، شارباژێڕ، قەرەداخی هێنابووە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو هێزێکی گەورەو دزگایەکی زلی پێکەوە نابوو. لەو ماوەیەدا قاتوقڕیو برسێتییەکی کوشندە لەبەغدا بڵاو بووەوە. سلێمان بەبە لەگەڵ دلاوەری موتەصەڕیفی شارەزووردا بوو بەشەڕی، دلاوەر کوژراو سلێمان بەبە کەرکوک کەناوەندی ولایەتی شارەزوور بوو گرت. والی بەغدا بەگفتو گەف ویستی بیهێنێتەوە ژێر باری فەرمانبەری، کەڵکی نەبوو. هێزی نارده سەری، ئەویش چاری نەکرد.



-3-

لەهەوڵی فراوانخوازیدا، سلێمان پەلاماری قەڵەمڕەوی ئەردەڵانی دا، هەورامان، مەریوان، بانە، سەقزی گرت. محەمەد خان چاری هێرشی سلێمان بەبەی پێنەکرا. شا سوڵتان حسێنی صەفەوی نامەی شکاتی بۆ سوڵتانی عوسمانی ناردو لەهەمان کاتدا لەشکرێکی گەورەی بەسەرکردایەتی عەباسقولی خانی زیادئۆغلی قاجار ناردە سەری. لەدەشتی مەریوان لێکیان دا. دای شەڕێکی خوێناوی سەرداری قزلباش سەرکەوتو سلێمان بەبە بەتێکشکاوی کشایەوە (لب: 74). ئەم هێرشەی سلێمان بوو بەهۆی هەڵتەکاندنی دەسەڵاتی محەمەد خانو دوورخستنەوەی میرەکانی ئەردەڵان تا چەندین ساڵ، لەکاروباری کوردستان

-4-

## ئەنجامەکانی شەڕی مەریوان (1111)

میر سلێمان، میری بابان بەشێکی وڵاتی گرت، لەو کاتەدا محەمەد خانی کوڕی خەسرەو خان والی ئەردەڵان بوو. والی خۆی بەرگەی ئەم هێرشەی نەگرت. شا سوڵتان حسێنی صەفەوی لەلایەکەوە نامەی شکاتی بۆ سوڵتانی عوسمانی ناردو داوای سزادانی میری بابانی کردو لەلایەکیترەوە لەشکرێکی گەورەی بەسەرکردایەتی عەباسقولیخانی قاجار ناردە سەری. لەدەشتی مەریوان شەڕێکی قورس لەنێوان لەشکری بابانو صەفەویدا قەوما. لەشکری بابان شکا. ئەم شەڕە دوو ئەنجامی بەدووی خۆیدا هێنا:

یەکەمیان: ئێران قەتڵوعامی کوردەکانی ئەردەڵانو عوسمانی قەتڵوعامی کوردەکانی بابانی کرد.

(قاسم سوڵتانی هەورامی بەعەباس خانی سەردار ڕائەگەیەنێ کەمحەمەد خانی والیو ئەهالی کوردستان لەگەڵ سلێمان پاشای بەبە هەم بەیعەتو هەم داستان بوون. سەردار حوکمی کوشتنی ئەهالی کوردستان دەرئەکات. منارەیەك لەکەللە سەرەکانیان دروست ئەکەنو سەری قاسم سوڵتانیش لەسەروو هەموویانەوە دائەنێن. من حفر بئرا لأخيه فقد وقع فيه) (لب: 76)، (مستورە: 76-77)و بەقسەی (تحفە)و (حدیقە) لەسەر ئەم دووزمانییە، سەرداری لەشکری صەفەوی یەك هەزارو پێنج سەد کەسی لێکوشتنو منارەیەکی لەکەللەی سەریان دروست کرد.

بەڵام بەپێچەوانەی قسەکانی (لب: 76)کەئەڵێت: سلێمان بەبە (لەگەڵ تاقمێکی کەم هەڵاتو ڕەوڵنەی ئەستەمبوڵ کرا) یان قسەکانی (مستورە: 77) کەئەڵێت: (سلێمان پاشای بابان کە لەهەردوو دەوڵەت یاخی ببوو پاش وتووێژ لەگەڵ والی بەغدا چارەنووسی خۆی لەوەدا دیت، کەعوزر بۆ دەرباری عوسمانی بێنێتەوەو لێیان نزیك بکەوێتەوە). یان (لۆنگریك: 106) کەئەڵێت: (لەئەستەموڵ بەخۆشییەوە پێشوازی لێکرا..) یان (زکي، تأريخ السليمانية: 63-64) کەئەڵێت: (کرا بەحاکمی ئەدرنە)، بەڵکو وەکو (هامە پورگشتال: 2883/4) نووسیوێتی (لەزەمانی حکومەتی حەسەن پاشادا.. بەیارمەتی پاشاکانی حەڵەبو دیاربەکر شکێنراو ەگەڵ 17 بەگی کورددا کە لەیارانو یاوەرانی ئەو بون، کوژرا...).

دووەمیان: لەهەردوو ئەمارەتدا تا چەند ساڵێك دەسەڵات لەم لا لەدەست بنەماڵەی ئەردەڵانو لەولا لەدەست بنەماڵەی بابان دەرچوو.

لەو ڕووداوانەدا محەمەد خانی ئەردەڵان لێخرا، ئاخۆ ئەویش کوژراوە یان دوور خراوەتەوە، مێژووەکانی ئەردەڵان، جگە لە(لب: 77) کەئەڵێت: (تا ساڵی 1113 والی بووە) ئەوانیتر لەوبارەیەوە هیچ زانیارییەك بەدەستەوە نادەن، بەڵام دەربارەی صەفەوی دوای ئەوە تا ماوەیەك ئیتر ڕاستەوخۆ حاکمی بۆ کوردستان داناوە. بەڕێز محەمەد خانی گورجی (1113-1116)، حەسەنعەلیخانی ئیعتمادەل دەولە (1116-1118)، ئینجا حسەینعەلیخانی

بـرای (1118–1119)، ئینجـا کەیخوسـرەو بـەگ (1119–1121) کـراون بەحوکمڕانی کوردستان. (مستورە: 79)، (تحفە: 128–130)

لەولایش میرایەتی بابان لەوپەڕی ئائارامیدا دابەش بوویوو، ماوەی چەند ساڵێك (موتەسەللیم)ی تورك ڕاستەوخۆ بەڕێوەیان ئەبرد، تا خانە پاشا، لەسییەکانی ئەو چەرخەدا هاتەوە مەیدان. (العزاوی: 191/5)، (لۆنگریك: 157)

**تێبینی:** بۆ درێـژەی ئـەم شـەڕە بڕوانـە: (ذیـل: 22)، (لـب: 74–76)، (مسـتورە: 75–77)، (تحفـە: 127)، (حدیقـە: 141)، (نوانـی: 129–130)، (لۆنگریك: 105)، (امین زکي، تاریخ السلیمانیة: 62)

## بنیاتنانی شاری سنە
## سلێمان خان کوڕی عەلەمەدین (1046ـ1066)

-1-

کـەخان ئەحمـەد خـان لـەدەرباری صەفەوی هەڵگەڕایەوەو پەنای بۆ ڕۆم برد، شا صەفی (1039–1052)، سلێمان خانی کوڕی میر عەلەمەدینی لەجێ کرد بەوالی ئـەدەڵان. میـر عەلەمـەدینی بـاوکی، لەسەردەمی خاندا لەگەڵ پەنای بۆ ڕۆم بردبـوو، بـەڵام بـەنائومێدی لـەوێ مردبوو، ئەوکاتـە سلێمان خان لەگەڵ خان ئەحمەد خاندا بەشداری شەڕو لەشکرکێشـییەکانی بـوو. سـلێمان لەخۆی ترساو هەڵات. پەنای بۆ دەربـاری شـا صـەفی بـرد. لەپێشدا گوێـی پێنـەدراو ژیـانێکی ناخۆشـی بەسـەر ئەبرد. تا شا صـەفی بەلەشکرەوە بۆ شەڕی عوسمانی چووە سەر قەڵای ئێرەوان. بسلێمان لەم شەڕەدا ئازایەتی نواند. ئەمە بووە هۆی نزیککەوتنەوەی لەدەزگای صەفەوی. کەخان ئەحمەد خان لێخرا، شا صەفی ئەمی نارد بۆ کوردستان.

-2-

### بنیاتنانی سنە

سلێمان بەڵێنی بەشا دابوو (دارولمولکی کوردستان) بگوێزێتەوە. ساڵی 1046 هەمان ساڵی دەستپێکردنی حوکمڕانی خۆیو تێکشکانی خان ئەحمەد خانو مردنـی، لەسـەر گردێك لەجێگایـەکدا کـەناوی (سـینە) بـوو قەڵایـەکی قایمی دروست کرد. خانوو و حەمامو مزگەوتو بازاڕی تێدا بنیات نا. چەند جۆگەیەکی لەدەشتی سەرنووێ ڕۆژئاوای سنەوە ڕاکێشاو بەسێ حوشترگەرو ئاوەکـەی بـۆ نـاو قـەڵا سەرخسـت. قـەڵاکانی زەڵـم، حەسـەناواو پڵنگـانی ڕووخاندو (دارولحکومە)ی ئەردەڵانی گوێزایەوە قەڵای تازە، کە لەناو خەڵکدا بەسنە ناوی دەرکرد. (لب: 67–69)، (مستورە: 64–66)، (حدیقە: 136–137).

مێژوونووسـەکانی ئـەردەڵان ئـەڵێن نیـاز لـەڕووخاندنی قـەڵاکانی زەڵم، حەسـەناواو پڵنگـان ئـەوەبوو کـەئیتر هیچکـام لـەمیرەکانی ئـەردەڵان ئـەتوانن لـەکاتی سـەرپێچیو یـاخیبووندا لەشـاکانی ئـێران خۆیانی تێدا قـایم بکـەن. ڕەنگـە ئەمـە هۆیـەك بێت، بەڵام هۆی لەمە گرنگتر ئەوەبوو: میرەکانی ئـەردەڵان ویسـتوویانە بنکـەی ئەمارەتەکـەیان لەسـنووری دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانیو دەستدرێژییەکانی پاشـەڕۆژی دوور بخەنـەوە. بەتایبەتی دوای ئەوەی شارەزوور، شـارباژێڕ، قەرەداخ لەسنووری قەڵەمڕەوی ئەماندا ئەماو کەوتـە سـنووری دەوڵـەتی عوسمانییـەوە، ئیـتر ئـەم قەڵایانـە هـەموو کەوتبوونـە سەر سنوورو بەئاسـانی لەشـکری دوژمن ئەگەیشتە سەریان.



**بەشێك لە كتێبی**
**(مێژووی ئەردەڵان)**

**ماه شەرەف خانی ئەردەڵانی (مەستوورە)**

## فەرمانڕەوایی کەریم خانی کوڕی عەباسی قولیخان

(1)

کاتێك کەریم خان چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی هەناسەی وردو درشتی خەڵکەکەی چنیو بەهاتنی شوومو بەدوومی سەرلەبەری خەڵکی کوردستان دڵگیرو پەست بوون. ئەم فڕی لەفەرمانڕەوایی نەدەزانیو سەری لەهیچ کاروبارێکی حوکمڕانی دەرنەدەکرد.

وڵاتەکە بەبۆنەی نەکارەییو دەستوپل سپێتیو ناکارامەیی‌یەوەی بەجارێ شێواو شیرازەی هەموو شتێك تێکچوو و کاروبار رووی لەکزیو لەرولاوازی کرد. کابرا هێند ملهوڕ بوو گوێی لەقسەو راوێژی کەس نەدەگرت. ئاژاوەو پاگەردانی لەسەروبەندی ئەم فەرمانڕەوایەدابەئەندازەیەك گەیشتبوو، وەك دەگێڕنەوە:

یەکێ لەسەر بەگەورەکانی ویلایەت بۆ دزی دەچێت، خۆی دەکوتێتە ماڵێکەوە، بەرێکەوت خاوەن ماڵ بەخەبەر دەبێ، ناکاتە نامەردی دەیگرێتو بۆ سبەینێ زوو، بەدەستبەستراوی بۆ کن کەریم خانی دەبا، کەچی کەریم خان لەجیاتی ئەوەی سزای دزە بدات، وردوبارێك هەردوو گوێی دەبڕێتو لەنێو مستی دەنێو بەرەڵلای دەکات.

هەروەك لەبەرایی‌یەوە باسمان کرد لەو سەر وەختەدا حەسەن عەلی خانو سەلیم پاشا بەگژ یەکدا چووبوون، ئیبراهیم بەگی وەکیلیش لەناوچەی پلنگانو بیلوانو ئەو دەوروبەرە، ئاڵای سەربەخۆیی هەڵ کردبوو. هەرکە وانی وڵات بێ‌خاوەنەو خەڵکەکەیش لەوپەڕی زەبوونیو پەرێشانیدانو ئەمیش لەگەڵ خانەدانی زەندی‌یەدا سەروساختو بەندوبارێکی بەهێزی هەبوو، داوای لێکردن، کەریم خانی فەرمانڕەوای ئەردەڵان لابدەنو ناوچەی کوردستان لەبەر یەك هەڵتەکێنن. زەندی‌یەش یاروەیس خانی بەسەد سوارەوە خستە پاڵ هێزەکەی ئیبراهیم بەگ کەئەمیش دوو سەد سوارێك دەبوو، ئەم هێزە لەسەرەتای چلەی زستاندا، لەدێی دۆشان دامەزران. کەریم خانی ئەردەڵانیش کەئەم خەبەرەی بیست، بەخۆی رانەپەرموو، بەرامبەر ئەم هێزە راوەستێ. سەرماوسۆڵەی زستانەکەیش لەوزە بەدەربوو، ناچار لەگەڵ گەورەو پیاو ماقووڵانی سنەدا کۆچیان کرو چونە ناوچەی شامیان کەسەر بەهەرێمی هەورامانە، لەوێ نیشتەجێ بوون. کەریم خانو گەورە پیاوەکان سێ‌مانگەی زستانیان لەوێ بەوپەڕی ناخۆشیو تەنگانەوە بەسەر برد. لەسەرەتای بەهاردا روویان کردە شارەزوورو سەریان بۆ پاشای شارەزوور دانەواندو ملکەچی بوون. وەك دەڵێن؛ کەریم خان هەر لەوساڵەدا کۆچی دوایی کردووەو کوردستانی ئەردەڵان بێ‌فەرمانڕەوا ماوەتەوە. تا ئەو کاتەی خوسرەو خانی کوڕی خان ئەحمەد خانی کوڕی سوبحان وێردی خان لەساڵی 1165ی ك دا سەربەخۆو ئازاد، کاروباری ئەیالەتەکەی بەدەستەوە گرتو خۆی کرد بەفەرمانڕەوای وڵات. بۆ ماوەی ساڵێك دەستی یارمەتیو نوازشی بۆ ژێردەستانو دەستەوسانان راکێشاو بەم جۆرە کاتی بەسەر برد، بەڵام لەساڵی 1160ی ك دا سەلیم پاشای بابان بەیارمەتی ئازادخانی ئەفغانی بوو بەمیری کوردستانو خوسرەوخانی لەم میرایەتی‌یە بەرکەنار کرد.

لەسەروەختی‌فەرمانڕەوایی سەلیم پاشادا زۆربەی گەورەکانی سنە چۆن لەمەڵبەندی بابان جێنشین بوون ئەوانەی سنەیش مابوونەوە لەپیاوماقووڵو رەمەکی، هەموو لەرەفتاری چاكو پەسەندی سالیم پاشا شادمان بوونو ئەیالەتەکە بەرەبەرە رووی لەئاوابوونەوەو بوژانەوە کردو سەرتۆپی خەڵکیشی بەدڵی خۆشەوە خەریکی کشتوکاڵو شار ئاواکردنەوە بوون. ئیتر بەم جۆرەسەلیم پاشا بۆماوەی چوار ساڵ لەناوچەی کوردستانی سنە فەرمانڕەوایی خۆی بەڕێوە برد، تا ئەوەی لەساڵی 1170ی ك دا خوسرەوخان بەیارمەتی حەسەن خانی قاجار مێرنشینی ئەردەڵانی گرتە دەستو فەرمانڕەوایی بابانی لەئەردەڵان لەناو برد.

### خوسرەوخانی دووەم

خوسرەوخانی دووەم کوڕی خوالێخۆشبوو خان ئەحمەد خانو ئەوەی خوالێخۆشبوو سوبحان وێردی خانە. وێڕای ئەوەی سوبحان وێردی خان منداڵی نێرینەی زۆروزەوەند بوونو لەبەرئەوەی لەژیانیدا، کەپێشتر لێی دوواین؛ خان ئەحمەد خانی کوڕی وڵاتی بەجێهێشتو لەوڵاتی رۆم گیرسایەوەو لەدراوسێتی ئیمامە پاکەکاندا بۆخۆی سەری نایەوەو دوو کوڕی لەپاش بەجێمان: یەکەمیان: خوسرەو خانی کوڕی، کەکوڕە گەورەی بوو؛ هێندەی رۆحی خۆی دەویست. هەمیشە ژەنگو پەلاسی غەمو پەژارەی ئاوێنەی دڵی بەدیمانەی ئەو ئاودارە دەسڕی‌یەوەو ئەوی لەچاو کوڕەکانی دیکەیدا لەسەرووی هەمووانەوە رادەگرتو لەرێورەسمی گەورەییو نیهادپاکیدا هەمیشە پەسنی دەداو بەبالای هەڵدەگوت. زۆر جار لەبەرەوڕووی کوڕەکانی دیکەیدا بەپیاوەگەورەکانی مەجلیسەکەی دەگوت؛ ئەم پلەپایەیە پاش ئێمە، هەر شایانی کارامەییو توانو ئەەبێ ئەوەو هەر خۆی دەبێ بەخاوەنی. بەهەرحاڵ، چون لەساڵی 1170ی ك دا خوسرەو خانی کوڕی ئەحمەد خان بوو بەفەرمانڕەوا دەرووی ئاژاوەو ئاشووبی لەڕووی ئاژوەگێڕان بەستو گەڵاڵەی ئیقباڵی لەهەوری پڕ بارانی بەخشندەیی لەچیمەنی ئارەزوو و هەویادا رووا و پڕاو ئەیالەت رەنگو رەونەقێکی نوێی بەخۆیەوە گرتو تەڕو پاراوی‌یەکی لەرادەبەدەری لێ‌نیشتو گوڵشەنی هیوا لەشنەی دادپەروەری سەوزو پڕاو بوو و خونچەی هەویاو ئاوات بەبۆنوبەرامەی‌دەهەندەیی شادمانو خەندان بوو.

جیهانی سەرلەنوێ رازاندەوە
غەمزەی خستە گۆنای وڵاتەوە
لەفەڕو بەرەکەتی ئەو گوڵی شادی رووا
مزگێنیی جوانیو لاوێتی بەپیران درا
بەزیندووکردنەوەی ئایینی روون
هەناسەی بوو بەهەناسەی عیسا
لەخانەی بەخشندەییدا حاتەم بەرماوخۆرە
لەمەیدانی ئازایەتیدا رۆستەم هاوسەنگەریە
لـ سەروبەندی ئەودا زۆروستەم ئاسەواری نەما
بەو تازە بۆوە رێورەسمی خوسرەوو جەم

خەڵکی وڵات بەفەڕی هاتنی شادو دڵخۆش بوونو بەگەرمیی بوونی پیرۆزی مەجبووری گوێ بەفەرمانی بوون. سەرلەبەر لەتەپڵی ئمادییان داو گەردنی موژدەیان قوت کردەوەو رێگای (پیر)و (مرید)ی‌یان گرتە بەرو شێوەی رێورەسمی باوباپیرانیان بەیاد کردەوەو رێگای خۆبەختکردنیان لەپێناودا گرتە بەرو ئەو بنەماڵانەی لەوڵات دوور کەوتبوونەوەو چاوەڕوانی هاتنی فەرمانڕەوایەکی زەبردەستو توان بوون، هەموو گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

لەسای بەزەیی خوسرەوی بارام ئاساوە گشت حەسانەوەو کەوتنە ئاواکردنەوەی خانووبەرەو ماڵومولك و کێڵگەو باخاتیان و بەتەواوی سەر ئاسوودە بوون و شادو شوکور ژیان.

لەبەرئەوەی شاری سنە چەنانی بەهۆی ئاژاوەوە وێران ببوو لەڕەونەق کەوتبوو، خوسرەوی سەربەست و ئازاد بەرژەوەندی لەوەدا دیت قەڵای حەسەن ئاباد بەمەرکەزی ئەیالەتەکەی هەڵوژێرێ، بۆئەوەی بتوانێت وڵاتەکەی ئاواکاتەوە. خەڵکی کوردستانی ئەردەڵان کەدیتیان ئەم خوسرەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵات سەری پێوە نییەو زۆری بۆ تێدەکۆشێت و رەنجێکی فرە بەخەرج دەکات و زۆری بەتەنگەوەیە، سەرلەبەر کەمەری گوێ بەفەرمانییان بۆ بەست و بەدڵ و گیانەوە خۆیان لەپێناودا بۆ بەختکردن ئامادە کرد.

جگە لەمحەمەد رەشید بەگی وەکیل کەدوای شکانی حەسەن عەلی خان، کە لەناوچەی پاڵنگان و ئەلەك و رەوانسەر سەربەخۆ فەرمانڕەوایی دەکردو لەسەردەمی سەلیم پاشادا کوژرا، محەمەد بەگی کوڕی جێگای گرتەوە. کاتێك کەخوسرەو خان ئەیالەتی ئەردەڵانی بەدەستەوە گرت، دژی راوەستاو گوێی نەدا بەفەرمانی میهر عەلی سوڵتان و خوسرەو بەگی ئامۆزایشی لەشاری سنە. خوسرەوخانی دووەم کەوتە راوێژکردن لەگەڵ خەڵکدا. دوای وتووێژو راوێژ وایان بەچاك زانی دوو کەس لەسەرۆکەکانی ئەو بنەماڵەیە کەمایەی ئاشووب بوون لەناو ببرێن بۆئەوەی کاری هەموولایەك سەقامگیر ببێت و سەرپێچیکەرەکان ملکەچ بکەن. بەم بڕیارە رۆژێك کەمیهر عەلی سوڵتان وەك جاران بۆ ئیسپاتی وجود هاتبو، فەرمانی گرتنی بەپێش قەراوڵەکانی دابوو و بەفەرمانی خوسرەو خان بەند کرا. پاش گرفتاری میهر عەلی سوڵتان برێك کەس بۆ گرتنی خوسرەو بەگی برایشی راسپێردران. خوسرەو بەگ هێند لەخۆی بایی بوو، خۆی بەرۆستەمێ دەزانی و گوێی بەقەزا نەدەدا. پاش شەڕوشۆڕێ سەریان پەڕاندو کوشتیان. دوای کوشتنی ئەو، فەرمانی کوشتنی میهر عەلی سوڵتانیشیان دەرکرد. ئیتر بەم جۆرە هەردووکیان بەسزای کردەوەی خۆیان گەیین و ماڵ و سامانیان سەرلەبەر کەوتە دەست خوسرەوخانی دووەم. هەر لەم سەروبەندەدا ئازاد خانی ئەفغانی بەدووزمانیی سلێمان پاشای بابان کەهۆزو پەیڕەوانی لەدەوروبەری سنە بەر شالاوی نـ سدرێژی خوسرەوخان کەوتبوون، بڕیاری دا سنەو قەڵای حەسەن ئاباد بگرێت. بەدوو هەزار کەسەوە رووی کردە سنە. محەمەد رەشید بەگی وەکیلیش هەلی وەدەست هێناو خۆی گەیاندێ. خوسرەو خان دوای بیستنی ئەم خەبەرە سنەی بەجێهێشت و رووی کردە قەڵای حەسەن ئاباد. ئازادخانیش لەداوێنی قەڵاکەدا لەشکری خۆی دامەزراندو چەند جارێك تێك گیران. خوسرەو خان بەسەر لەشکری ئەفغاندا زاڵ بوو و محەمەد رەشید بەگی وەکیل و محەمەد ساڵح بەگ کە لەهاودەستانی ئازادخان بوون زۆر بەجەختەوە هەوڵیان دەدا لەشکری خوسرەو خان بشکێنن. لەبەر ئەمە، هەر دوای هەڵاتنی ئازادخان محەمەد ساڵح بەگ گیرا و خوسرەو خان فەرمانی دا، هەردووچاوی هەڵکۆڵن و بەسزای خۆی گەیشت.

ئەوەی شایانی باسە، لەبەرئەوەی گەمارۆدانەکە چل رۆژی خشتی خایاند، خوسرەو خان هیچی بۆ ئەمایەوە ئەوە نەبێت داوای یارمەتی لەشێخ عەلی خانی زەند بکات کە لەهەمەدان هەڵوێستی کردبوو، ئەویش بەلەشکرەکەیەوە بەنیازی شەڕ رووی کردە سنە، بەڵام ئازادخان هەر کەئەم هەواڵەی بیست، ناچار هەڵات و دەستی لەگرتنی قەڵاکە هەڵگرت.

شێخ عەلی خانیش دووی کەوت. پاش هەڵاتنی ئەفغانییەکان، هەرچی ماڵوسامانی سلێمان پاشا هەبوو، سەرلەبری تاڵان کرد و لەسەراغەوە گەڕایەوە بۆ هەمەدان.

دەگێڕنەوە: لەکاتی گەمارۆکەدا هەموو رۆژێك سوارێك لەئەفغانییەکان دەهاتە بەر مەیدان و داوای جەنگاوەری دەکرد. هەرکەسێکی لەقەڵاوە دەهاتە بەرەیپیل بەسیری ئاوداری، مەرگی پێدەنۆشی و دەیکوشت. تا رۆژێك محەمەد ئاغای جڵەرداری تایبەتی خوسرەو خان کەباپیری رۆستەم بەگی میرئاخوڕە، دەمارێ پیاوەتی بزووت و چەك و سیلاحێکی لەئەویلەی توبارەکەدا بوو. لەخۆی داو سواری ئەسپی تایبەتی والی بوو و هەڵیکردە سەر جەنگاوەرە ئەفغانییەکە. ساوار لەقەڵاییەکاتەوە هەستابوو کەمحەمەدی جڵەودار بەئەسپ و ئەسلەحەی خوسرەوی ئاوداروە پشتی لەئاغای خۆی کردووەو لێی یاغی بووە. ئەو شێرە ئازایە هاتە مەیدانی ئەو شێرە ئەفغانییەوەو تیغی ئازایەتی لەکێلان دەرکێشاو لەیەکەم هەڵمەتدا سەری پڕ لەقیزو فیشاڵی لەلاشی جیا کردەوەو بەرەو قەڵا گەڕایەوە. سەری دوژمنی لەبەرپێی خوسرەو خاندا دانا. پاش ئافەرینگران بەخەڵاتی پایەی میرئاخوڕێتی سەر بڵند کراو لەو سەردەمەوە تا ئێستاکە دەوڵەتی رەزاقولیخانی کوڕی خوسرەوخانی کوڕی ئەمانوللا خانی کوڕی خوسرەوخانی دووەمی تێدایە، ماوەی 98ساڵە ئەم پایەی میراخوڕییە لەبنەماڵەی ئەواندا ماوەتەوە.

بەپێی ئەو مێژووەی خوسرەو بەگ دایناوە وا دەردەکەوێ محەمەد ئاغا هێشتا ئەم کارەی پێنەسپێردرابوو، کە بەفەرمانی خوسرەو خان بۆ ئۆردووی ئازادخان رەوانە کراو بەزمانی ئەوەوە بەئازادخانی گوت: خوسرەوخان دەفەرمووێ راوەستانت لەداوێنی ئەم چیایە بێسوودەو لەشکرێکی گەورەیشت لەگەڵدا بێت، هەر هەوڵ و تەقەلایەکی بیدەی بێسوودەیەو قەڵاکەت بۆ ناگیرێت. تا گیانم تێدا مابێت داگیرکردنی ئەم قەڵایە بەدەستانی سەر ناگرێت و هیچ کارێکتان پێناکرێ.

ئیتر لەمە زیاتر رەنجی خۆت بەبا مەدەو ئەو موسوڵمانانەی لەخۆتت کۆکردوونەوەلەمە پتریان تەنگاو مەکەو ئازەحەتیان مەکە. گەمارۆدانی ئەم قەڵایە دەبێت بەمایەی بەدناوی و ئابڕووچوونت. سەرت شۆڕکەو رێی وڵاتی خۆت



بگرە بەر. ئەم ئاواتەت هەرگیز نایەتە دی، بگرە بۆت دەبێت بەهۆی دەردی سەری و مەینەتی.

پاش ئەم رووداوەو راگەیاندنی پەیامەکەی خوسرەو خان، ئازاد خان زۆر تووڕە بوو، گوتی: ئەگەر کارەکە وابێت، قوڕ بەسەر ئازاد. ئیتر هەرئەوەندەی بۆکرا، راست هەڵاتو رۆیشت. دوای ئەمە خوسرەو خان شێخ عەلی خانی نارد بۆ ئاوەدانکردنەوەی خانووبەرەکانی هەمەدان. شێخ عەلی خانیش لەوێ دەغڵو دانو خەرجو باجێکی زۆری خڕ کردەوەو ناردی بۆ کوردستانی ئەردەڵان. جا لەبەرئەوەی خوسرەو جان لەم سەروبەندەدا لەمەرکەزی ئەیالەت دوورکەوتبووەوە بەڕێوەبردنی کاروباری سنەو قەڵای حەسەن ئاباد بەرەو رووی راو تەدبیری میرزا عەبدوڵلای وەزیر، کەباپیرە گەورەی دانەری ئەم کتێبەیە لەدایکەوەو یوسف بەگ کردبووەوە. ئەم دوو زاتەیش، بەدەست باجگرانی زەندییەوە بەجارێك تەنگیان پێ هەڵچنرابوو. لەنیوەشەوێکدا ناچار باروبنەیان پێچایەوەو هەڵاتن بۆ ناوچەی شارزوورو ماڵو منداڵی خوسرەوخانیان لەقەڵای حەسەن ئاباد بەجێهێشت. خوسرەو حان هەرکە ئەم هەواڵەی بەرگوێ کوت بەپەلە گەڕایەوە بۆ قەڵاکەو ماڵو منداڵو پەیرەوانی خۆی هەموو کۆچ دان بۆ سنە. پاشان قەڵای حەسەن ئابادی، سەبارەت بەوە کەدەبوو بەمەکۆی دژمنانی لەکاتی ئاژاوەو ئاشووبدا، وێرانو خاپوور کردو لەو رۆژەوە تا ئیمڕۆکە هەروا خاپوورو وێرانە. لەبەرئەوەی کەریم خانی زەند لەدژ محەمەد حەسەن خانی قاجار ئالای سەربەخۆیی هەڵکردبوو و هەوڵی دەدا سەڵتەنەتی ئێرانی دەستکەوێت، هەرچەندە تا ماوەیەك شەڕوشۆڕ گەرم نەبوو، بەڵام ئاخرییەکەی کار لەکار ترازاو شەڕ لەنێوانیان گەرم بوو و لەشکری زەندییە بەسەر لەشکری قاجاردا زاڵ بوو و محەمەد حەسەن خان خۆیشی لەو شەڕەدا شەربەتی شەهادەتی نۆشی. ئیتر بەم جۆرە کەریم خانی زەند فەرمانڕەوایی سەرانسەری وڵاتی ئێرانی گرتە دەستو شاری شیرازی کرد بەپێتەختی خۆی.

لەو سەردەمەدا سلێمان پاشای بابان کەوتبووە سەر کەڵکەڵەی داگیرکردنی ئەیالەتی سنەو دەیویست ئەو ناوچەیەش بخاتە سەر قەڵەمڕەوی حوکمڕانی بەبە، یەکێك لەباوەڕپێکراوانی خۆی نارد بۆ شیراز، ئەم خواستەی لەکەریم خان راگەیاندو بەڵێنی دایە خزمەتگوزاری بێت، پاش گەیشتنی نوێنەرەکەی سلێمان بەخزمەت کەریم خانی زەند، کەریم خان ئەوەی هەر لەدڵدا مابوو کەفەرمانڕەوایی خوسرەو خان لەڕاستیدا بەهاوکاری محەمەد حەسەن خانی قاجار دەستی کەوتبوو، لەبەرئەوە خۆی لەبەدناوبوون نەجات کردو فەرمانڕەوایی سنەی دا بەسلێمان پاشای بابانو لەساڵی 1177ی ك دا سلێمان پاشا بەفەرمانی کەریم خانی زەند ناوچەی ئەردەڵانی داگیر کردو یارمەتی دا. هەر لەم سەردەمەدا ئەحمەد پاشا لەناوچەی شارەزوور دەستی کێشرابووەوە، سلێمان پاشا ئەو ناوچەیەشی خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆی، بەڵام والی بەغدا بەم کارە رازی نەبوو و قبووڵی نەکرد. والی بەغدا بەلەشکرێکی گەورەوە کەبیست هەزار سەربازێ دەبوو لەیەنگیچەری و عەشایەری عەرەب، بەتۆپخانەو زەمبوورەکخانەوە بۆ گوێڕاکێشانی سلێمان پاشا رووی کردە شارەزوورو ئەردەڵان. ئەمین پاشای موسڵو عەبدوڵلا پاشای زەهاویش لەگەڵ ئەم لەشکرەدا بوون. لەشکرەکە سەرلەبەر لەناوچەی کفری کۆبووەوە. سلێمان پاشایش لەولاوە بە دە دوازدە هەزار سوارێکەوە لەئازایانی ئەردەڵانو بابان بەرەنگاری لەشکری عەلی پاشای والی بەغدا بوو. پاش تێکگیرانی هەردوو لەشکرەکەو شەڕ گەرم بوون، شنەی سەرکەوتن ئاڵای لەشکری رۆمی شەکاندەوەوسوپای بابانو ئەردەڵان شکانو هەڵاتن. زۆربەی کەڵەپیاوانو دلێران لەو شەڕەدا کوژرانو بەدیل گیرانو هەرچییەکیان لەچەكو جبەخانە لێ وەگیر هات بەدەست رۆم کەوت. عەلی پاشا دوای ئەم شەڕو سەرکەوتنە درەخشانە ئەحمەد پاشای برای سلێمان پاشای نارد بۆ ناوچەی شارەزوورو فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیەی پێ سپارد، بەڵام زۆری نەخایاند، سلێمان پاشا لەشکری خڕ کردەوەو بەنیازی گرتنەوەی شارەزوور هەڵیکوتایە سەری و ئەحمەد پاشای لەو ناوچەیە هەڵکەندو رای فڕاندو خۆی بوو بەفەرمانڕەوای ناوچەکە.

ئەوەی شایانی باسە ئەو خانەدانە سنەییانەی ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش بەهۆی ئاژاوەی ئەردەڵانەوە هاتبوونە شارەزوورو بەشێکیان لەسەروەختی خوسرەو خاندا بۆ جێگای خۆیان گەڕابوونەوەو لەوانەی مابوونەوە کۆچی دانو بۆ وڵاتی خۆیانی گەڕاندنەوە.



سلێمان پاشای بابان عەلی خانی کوڕی بەماڵو منداڵەوە بەبارمتە نارد بۆ شیراز، هەروەها فەرمانڕەوایی سنەشی بەحەسەن بەگ، کوڕەکەی دیکەی سپاردبوو. خۆیشی ماوەیەك لەسنەو ماوەیەك لەشارەزوور بەسەری برد، تا لەساڵی 1178ی ك دا پیاوێك بەناوی فەقێ ئیبراهیمەوە شەوێك لەشەوان خۆی گەیاندە ناوچەی شارەزوور، سلێمان پاشای بەدەم خەوەوە کوشت. پاش کوژرانی سلێمان پاشا محەمەد پاشای برای فەرمانڕەوایی شارەزووری گرتە دەستو عەلی خانی کوڕی سلێمان پاشایش بەفەرمانی کەریم خانی زەند رووی کردە ناوچەی سنەو بوو بەفەرمانڕەوای ئەوێ. بۆ ماوەی ساڵێك سا بەهەر فڕوفێڵێ بوو گوزەراندی، بەڵام چونکە نەیدەتوانی بپەرژێتە سەر فەرمانڕەوایی، محەمەد رەشید بەگی وەکیلو میرزا عەبدوڵڵای وەزیرو میرزا صادقی مستەوفی روویان لەدەرباری کەریم خانی زەند ناو داوایان لێکرد لەکاری بخات. پاشان نەواب خوسرەو خان کە لەگۆشەو کەنارێکی کوردستاندا دوورەپەرێز خۆی مەڵاس دابوو، لەساڵی 1180ی ك دا کرا بەفەرمانڕەوای ئەردەڵان.

## هەڵۆخان[٢٧]

پاش ئەوەی تەیموورخان لەساڵی 98ی کۆچیدا کوژرا هەڵۆخانی برای، بووکە وڵاتی لەباوەشکرد، چۆن فەرمانڕەوایی بەپێوقەدەمی پیرۆزی فراژیبوو گەشایەوەو گوڵشەنی پاتشایی لەدەهەندەییو دڵاوایی تەڕو پاراو بووو وڵات لەسەروبەندی ئاوەدانو ژێردەستان لەدادەپەریدا زۆر شادمانو کامەران بوو. لەکەڵەمێردیو ئازایەتیدا سەت پلە لەبراکەی لەپێشتربوو لەخەڵك نەوازیو بەندەییدا، لەسەرانسەری وڵاتدا ببوو بەداستانی سەرزاری گەورەو بچووك.

سپاییو لەشکری لەپیرۆزیی پێو قەدەمی شادمانو رەعیەتو ژێردەستان لەفەیزی بەزەییو نوازشتی جمرانەی ئاسوودەییو سەرسووکی. چیمەنی فەرمانڕەوایی هەوری دادپەروەرییەوەی تێراو، ئەمامی کامەرانیی لەزوڵاڵی بەزەییەوەی تەڕو پڕاو. ئەویش وەك برا ئاودارەکەی هەر لەسەرەتای کارەوە لەگەڵ سوڵتان موورادی پاتشای رۆمدا رێککەوت. هەروەها لەگەڵ شاعەباسی سەفەویدا لەروی بەرژەوەندەوە دەرووی دۆستایەتیی کردەوە. سەروسامانێکی زۆرو گەنجێکی بێ شوماری لەسەروبەندی خودا پێکەوەنا. زۆربەی کاتی پڕمایەی بەقەڵارۆنانو مزگەوت بنیاتنانو قوتابخانە دروستکردنەوە بەسەربرد. هەروەها قەڵای زەڵمو قەڵای پاڵنگان کەبەئەسڵ پێتەختی تیرەی گۆران بووەو بەگەردەلوولی رۆژگار وێرانو خاپوور ببوو، ئاواکردەوە. دەڵێن، قەڵاییکی تا بڵێی سەختو دژێکی ئێکجار قاییم بووە. تەنانەت لەبەر سەختیو دژواریی رێڕەوەکەی دوژمنو نەیار زۆر بەزەحمەتی لێ پەڕوینەوەو لەکاتی قەڵاپارێزیدا بوو بەکۆسپو لەمپەر لەرێی هێرشکەراندا. هەروەها قەڵای حەسەنئاوایشی ئاواکردەوە، کەبەراستی خودای ئەفرانکار، سەرانسەری دنیا بگەڕێی، قەڵاو مەڵبەندێکی وا بەم شانو شکۆیەی لەهیچ شوێنێ دروست نەکردووەو هیچ دنیادیتەیێك چاوی بەشتی وا نەکەوتووە.



ئەمەیش باسو خواسی لەهەموو دێرۆکو مێژووی دنیادا تۆمار کراوەو پەسنو وەسپی لەپەرتووكو دەفتەری زۆرینەی جیهاندا نووسراوە. من ئەم کەمینەیە، بەچاوی دیتم خۆم بالێوزی ڕووسو ئینگلیس لە سەردەمی فەرمانرەواییی ئەمانوڵلاخانی والی دا بە ناوی دیتنی ئەم قەڵایەوە، بە سەر کوردستان(سنە)دا تێدەپەڕینو لەگەڵ ئەوەش دا کە قەڵاکە وێرانە بوو، سەیرانی شوێنەوارو کەلاوەکەیان دەکرد.

لە شاری مەریوانیش ،قەڵایەکی سەختو قایمو بازاڕو گەرماوو قوتابخانەو مزگەوتێکی دڵگیری بنیات ناوە.

وەك دەڵێن ، ئاسەواری ئەم خانوو بەرەو ئاوەدانییە تا ئێستاش هەر ماوە. بەرە بەرە قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی یەکەی فرەوانتر بووەتەوەو شانو شکۆی بەڕادەیە گەیشتووە خەیاڵی هیچ کەسێ توانی ژماردنی نەبووە لەبەر ئەوە. دەرووی ڕێك کەوتنی لەگەڵ پاتشایانی ڕۆمو ئێران دا بەستو بەو پەڕی سەربەخۆییەوە لە وڵاتی خۆی فەرمانڕەوایی کرد.ئاو بە ئاوێکیش دەستی دەدایە تاڵانو بڕۆی دەوروبەری خۆیو ئاوازەی شانو شەوکەتی خۆی گوێی دوورونزیك گەیاند،تالە ساڵی 1019ی کۆچیدا حوسەینخانی لوڕکەڵەکەڵەی تۆڵە ساندنی کەوتە سەر، بە لەشکرێکی زۆرەوە هەڵی کوتایە سەر هەڵۆ خان، لە قەڵای حەسەن ئاباد شەڕوشۆڕێکی گەورە دەستی پێ کرد. هەڵۆ خانیش نەیکردە نامەردی لەشکرێکی بۆ تەمێکردنی حوسەینخان لە سەر ئەم بێ ئەقڵیو ملهوڕییەی بەڕی خستو زۆر چاکیان

گویٚ ڕاکێشا، ئەویش کە دیتی ئاڵای بەخت و خواستی کەچ و سەرەوژێرە، بە سەرشۆڕی‌یەوە هەڵاتەوە بۆ وڵاتی خۆی.

ئیتر هەڵۆ خان ، بەم جۆرە پێی لە فەرمان ڕەوایی و حوکمڕانی‌دا پتر چەسپی و دەسەڵاتی قایمتر بوو.

دەگێڕنەوە، شا عەباسی سەفەوی چەند جاریٚ لەشکرێکی گەورەو گرانی بۆ ژێردەست خستنی هەڵۆخان و وێران کردنی قەڵاو قەڵایچەکانی ئەو هەرێمە بەڕیٚ خستووە، بەڵام بیٚ‌ئەوەی بە هیچ ئامانجیٚ بگا، بە سەرشۆڕی گەڕاوەتەوە بۆ بارەگای سەفەوی‌یان. سەرەنجام ئەمە بووە بە هۆی زێتر باوەشێنکرانی ئاگری توورەیی پاتشای سەفەوی تەنانەت ،پاتشا، خۆی بە لەشکرێکی بیٚ شومارەوە،بە نیازی گویٚ‌ڕاکێشانی هەڵۆخانەوە، پێی هاویشتۆتە سنووری وڵاتی هەڵۆخان و لە گوندی مەیەم،کە کەوتۆتە ناوچەی ئەسفەند ئابادەوە.تەشریفی هەواری گرتووە.

ڕۆژێکیان، بەنیازی ئەوەی شارەزای ناوچەکەبیٚ، تەماشای کەژو کێوانی کوردستانی دەکرد، بەسەر کەژێکەوە گیرسایەوە. زۆربەی بەرپرسیارانی دەوڵەتی پاتشای دەستەو ئەزەر ڕاوەستابوون،(ئاڵی‌باڵی زەنگەنە)کە جەڵەوکێشی پاتشا بوو، جەڵەوی ئەسپەکەی پاتشای بەدەستەوە گرت بوو، لەخزمەتی‌دا ڕاوەستابوو. لەبەرئەوەی هۆزی زەنگەنە لە کوردستانەوە نزیکن و دراوسێی یەکن، شاعەباس لە ئاڵی‌باڵی زەنگەنەی پرسی، داخوا ئەو مەڵبەندەو قەڵاکانی لەچ حاڵو باڵێکدان، باری سوپای هەڵۆخان لە چ ڕادەیەکدایە؟ ناوبراویش لەوەڵامدا گوتی، ئەوەی شیاوی باسە، کوردستان قەڵاو قەڵایچەی زۆر سەخت و کەژوکێوی تاخەیاڵ بفەرمووی دژواری هەن، تەنانەت مەلی خەیاڵیش ناتوانیٚ بیان گاتیٚ، داگیر کردنی لە وزەو توانی هیچ خاوەن دەسەڵاتێکدا نیە. لەو بێشەیەدا نەڕەشێرو هوژە برانی کینەوەری واهەن لافی هاوشانی ڕۆسەمی داستان و ئەسفەندیاری پاڵەوان لیٚ‌دەدەن، مەترسی لەوەدایە سوپای پاتشا بەنیازی تەمێکردنی هەڵۆ خان بەڕێکەویٚ‌و خودانەخواستە ماوەی گەمارۆدانی قەڵا درێژە بکێشیٚ‌و لەبەر سەختی‌و دژواری قەڵا لەگرتنی ئانومێد ببیٚ‌و بیٚ‌ئەوەی بەهیچ ئامانجیٚ بگا، لە هەڵکوتانە سەری پاشگەز ببێتەوەو بەبیٚ‌هیچ دەسکەوتیٚ ڕێی هەڵاتن بگرێتە بەرو ئەمەیش ببیٚ بەمایەی ئەنگ و شورەی بۆدەسەڵاتی پادشای‌و دیارە شتی وایش لەگەڵ بەرژەوەندی دەوڵەتدا ئاگونجیٚ‌و لەوانەیە ئەم کزی‌و بیٚ دەسەڵاتیە ببێتە هۆی ئەوە کە هەڵۆخان بەجاریٚ دەست بەسەر هەموو ناوچەکانی وڵاتدا بگریٚ. چالەبەرئەوە، چاك ئەوەیە خودانی دنیا، پاتشا دەستی نوازشت و لاواندنەوە بەسەری دا بێنیٚ‌و بە تەگبیرو ڕاو پرس چارەسەری کارەکەی بکاو بەمە بخرێتە ڕیزی نۆکەرانی دەوڵەتەوەو ڕێگای خزمەت و سەر ڕاستی بگرێتەبەر. شایش بیری وردو سەرنجی ڕاستی ئاڵی باڵی پەسەندکردو پلەوپایەی زیادکردو لەچونەسەر هەڵۆخان پەشیمان بۆوە.

هەڵۆخانیش پاش ئەم کەین و بەینە خان ئەحمەد خانی کوڕی ، کەلەناو کوڕەکانی‌دا، بەنازایەتی و دەهندەیی و شۆخی‌و قۆچاخی ناوبانگی ڕۆیشتبوو،بەدەسودیاری گرانبایی‌یەوە ناردبۆ دەرباری شاعەباس . خان ئەحمەد خانیش پاش ئەوەی بەخزمەت شاعەباس گەیشت ،خەڵاتێکی زۆرکراو لەرادەبەدەر چاودێری کراو پەیتا-پەیتا ئەو پاتشا دادگەرە ناوبراوی بەنوازشتی زۆر وزەوەندسەر بلند کرد. پاشماوەیی کەپەهرەو توانی خان ئەحمەدخان لەشاعەباس ڕوون بۆوە ،لەپایەوپلەی زیادکردو خوشکە گەوهەرە درەخشانەکەی نێو گەوهەردانی شاهێتیی‌و ئەستێرە پرشنگدارەکەی ناو بورجی سەڵتەنەتی، کە ناوی زەڕینکولاه بوو پیٚ بەخشی و سەری بە زاواو خەزووریی شا بەرزبۆوە.وێرای ئەوەی کە مێژوو لەم بارەوەزۆری لە سەر نەڕۆیشتووە، بەڵام وەك لە پێشینانم بیستووە، دوای نیشان کردنی زەڕین کولاه، ئەو گەوهەرە گرانبایی‌یە ئەختەربڵێندە، بە هاوسەریی خان ئەحمەد خان قاییل نەبوو.

حەزرەتی پاتشا کە لاوچاکی و نازایەتیی خان ئەحمەد خانی لیٚ‌ڕوون بوودلێری‌و کەڵەمێردیی کەجێگەی شانازیی بنەماڵەی ئەردەڵانبوو، لە ئاوێنەی بیری‌دا ڕەنگی‌دابۆوەو سەردەرانەی تالاری بە بوونی





بەختەوەرانەیــەوە ڕازاندبــووەو بــە فــەڕی هێنــابوو،زەڕیــن کولاهــی بۆ ئەو جێگایــە کــە ئاسمــانی بــوو ، لــە ســەر زەوی جێگیر ببوو، لە تەنیشت خۆیـەوە دانا، ئەنجا فەرمانی دا کە لە دەرگای حەوشەوە خان ئەحمەد خان بێنن و لە دەرگایەکی دیکەشەوە نــەڕە شــێرێکیان، کــە چــەندین ســاڵ بــوو لــە کن شێرەوانەکانی شا لە زنجیر درابوو، بەرەڵلاکەن شێری تایەن لەو چەقی مەیدانەدا هەڵی کردە سەر خــان ئەحمــەد خــان و پەلاماری‌دا. ئەو هۆژەبرە چاونەترسە ئەسڵەمی‌یەوە، یەکسەر شمشــێری دلــێریی هەڵکێشــاو بــە هێزیبــازووی شــێرانەی و دەمــی شمشێری دلێرانەی شــێرەکەی کوشــت و لــەناوی‌برد. شای ســەفەوی ئەگــەر چی ئازایەتی و دلــێریی خــان ئەحمــەد خان‌ولەبەرچاو زیاتر بوو، بەلام لە کوشتنی شێرەکەو بێباکی ئەو دلێرە ناوبراوی سەرزەنشت کرد. خان ئەحمــەد خان لــە وەلام دا فەرمووی، ئێمــە دوو شــێری هاوتاو دلاوەر پــەلاماری یــەکترمان دا، یــەغیالْ هێنــای و بــەخت ســوار بــوو، مــن ئــەوم بەزاند. شا فەرمایشتە جوانەکەی ئەو لاوچاکەی زۆر بەدڵەوە چووورزەڕینکولاه بە هاوســەریی ئــەو هومــای کەشــکەلانی بلندی‌یــە شــاد بــوو. ئینجــا بــە ڕێ و ڕەسمێکی شایانی شاریاران بی‌وبە بەزەك و دۆزەك و دەبدەبەو سەنسەنەیێکی لە شانی گەورە پیاوان بوەشێتەوە هــەردوو پرشنگدار جووت بوون و بە یەك گەیشتن کە ماوەیێکی زۆر خان ئەحمەد خان لە باوەشی پەروەردەکردنی شادا ئۆقرەی گرت، شا ڕۆژ لــە دوای ڕۆژ پلەو پایــەی بلندتر دەکــردەوە و چــەندین ساڵ بوو شا زۆر بە ئارەزووی دیدەنیی هەڵۆخانەوە بوو لە مێژ بوو مرخی لە داگیرکردنی کوردستان خۆش کردبوو، بەلام سەبارەت بە سەختی و دژواریی قەلاو قەلایچەکانی کارەکەی بە شەڕوشۆڕ بۆ جێبەجێ نەدەکرا. ســەرەنجام لــە دووی خان ئەحمەد خانی ناردو دوو بە دوو بە یەك گەیشتن، ڕایەخی بەزم و ڕابواردنیان ڕاخســت و لــە پاش خۆشەویستی دەربڕیــن و دڵســۆزی و نوازشت دەرخستن مەبەســت و نیــازی ڕاگــەیاندی و گەنجینــەی ڕازی بــۆ کــردەوە، فەرمووی :لە مێژە من بە ئارەزووی دیدەنیی باوکتەوەم، بەلام لەبەر سەخت و دژواریی قەلاو قەلایچەکانی کوردستان نەمان توانیوە ئــەم ئارەزووەمان بەدی بهێنین و لــەم ڕووەوە شــەرمەزارین. جا ئێســتا، کــە تــۆ پێوەندی‌یــەکی تــەواوت لەگەڵ ئەم دەوڵەتە بەرزەدا هەیە، هەرکاتێ گەڕایتەوە بۆ کوردستان،سا بە هــەر فێلێبێ، هەڵۆخانمان بۆ دەربار ڕەوانە بکەو خۆت سەری کارەکە بگرەدەست. بێ گومان ئەم کردەوەیەت دەبێ بە مایەی ڕەزامەندی پاتشاو بەرزبوونەوەی پلەو پایەت و سەری پێوەنازێنت دەگاتە ئاسمان خان ئەحمەد خان بە هۆی زاوایــەتیی پاتشــاو تــەماحی حوکمڕانی‌یــەوە بــەڵێنی‌دا کــە خواســتی شــا بــەجێبێنێ و بــەم جــۆرە بــە دڵنەوایی‌یــەکی زۆرو خــەلاتێکی گرانبــەهاو بەخششێکی فرەوە لە دەرباری سەفەوی ترازاو بەرەو کوردستان بەرێ کەوت. کاتێ گەیشتە ئەوێ هەڵۆ خان لە مێژبوو کوڕە بەڕێزەکەی نەدیتبوو، وەکو ڕۆحی خۆی لێی نزیك بووەو بە پــڕی ئاسوودەیی‌یەوە ڕایان دەبوارد. خان ئەحمەد خان کەوتبووە سەر ئەو ئیزە باوکی بگرێت و بۆ دەرباری ئەسفەهانی بنێرێ خــۆی لــە پیــاو مــاقوولان و گــەورەپیاوان نزیــك خســتەوەو دەرووی خۆشەویستی و میهرەبانی بــۆ خســتە سەرپشت. هەریەکەیانی بــەپێی پلــەو پایــەی خــۆی بــە خــەلاتی گرانبــەهاو ڕێــزو بــەزەییی زۆرەوە نرخ لێدەنــا، تــا ڕۆژێکیان هەڵۆخان کۆڕێکی بۆ کوڕەکەی ڕازاندەوە، لەو کۆڕەدا پیاوماقوولان و سەرانی ســەرلەبەر هــەموو کۆکردبوونــەوە، خــان ئەحمــەدخان ســەرکارەکەی ڕاسپارد شیرینی و نوقوڵ و نەباتی زۆری ئەسفەهانی بۆ دانیشتوان هێنا، تا دەمیان شیرین کا. هەڵۆخان گورجێ، لە کارەکە گەیشت و دڵی زۆر نارەحەت بوو. فەرمووی، بەشیرینی و فروفێڵ دەمی منت لە گوژاڵگ تاڵ ترکرد. گوایە دەتــەوێ، هــەروا بــەم زمانلووســی‌یە چمــك و داوێنــی فــەرمانڕەوایی یەکــەم لەدەست دەرێنی ؟ کار گەیشتە ناخۆشی و کێشەو بەرەو خان ئەحمەد خان کۆڕەکەی بەجێ هێشت و لەوێ هەڵبرا، چوو سواری ئەسپەکەی بوو . لەتەك هاودەستانی دا لــەدەرەوەی قەلا گیرسایەوە لەدژی باوکی ڕاپــەڕی و دەرووی مافی باب و فرزەندیی لە خۆی بەجارێ پێوە دا قەدەرێ لەدەرەوەی قەلا بە شەرمەزاری یەوەمایەوە. ئینجا لە وگفت و بەڵێنەی بــە شــای‌دابوو، دەستە پاچــە وەســتاو لــە دەشــتی بــەرینی ســەرگەردانی و ڕوو زەردی‌ئلهــەر وادەتلایەوەو بۆخۆیشی نەی‌دەزانی چی بکا ...

هەڵۆخانیش لــەم ماوەیەدا دەرگای قەلای داخست .ماوەی گــەمارۆدانی قــەلا زۆری درێژە کێشا ،لەناکام دا دایکی خــان ئەحمــەد خــان یاســاولو دژدارانــی قوللەو بورجەکانی فریوداو لەژێرەوە لەگەڵیان دەستی تێکەڵ کردو بڕیاری‌دا لەنیوەشــەودا دەرکــەی قــەلا بکەنــەوە تاخــان ئەحمــەد خــان بێتــە قــەلاوەو کاری‌بــاوکی تــەواوکاو فــەرمانێکی لەئەستۆی خرابووجێبــەجێی بکــا. بــۆ ڕاگەیاندنی ئەم موژدەیە مەلا یــەعقووبی، کەباوەگەورەی مەلاعەباسی شیخو لئیسلامە، ناردە کن خان ئەحمەدخان بەگفت و بەڵێنی خۆش دڵی خۆش کرد. پاش ئەوی مەلا یەعقووب گەڕایەوە بۆناو قەلا، پیاوێکی سەربەهەڵۆخان بەم کەین و بەینەی زانی و ڕاستیی مەسەلەکەی لەخان گەیاند. هــەڵۆخان یەکسەر فەرمانی بەند کردنی مــەلا یــەعقووبی‌دا. بڕیاردرا،هەر بۆ ســبەینێی ئــەوڕۆژە بەسەختی سزابدرێ. چۆن خواوای فەرمان لەسەر بوو، مەلا یەعقووب ڕۆژی تەواونەبێ، سەرلە ئێوارە کە لەشکری تاریکی هێرشی هێنایەسەر ڕۆشناییی خۆر، شاهەن شای مانگ لەگەڵ سوپای ئەستێراندا هەڵیانکردە سەر ڕوناکیی خۆری تاوناك. خان ئەحمەدخان بەپێی تەمێی دایکی و پشت وانــی خــودای دادگــەر هاتــە بــن قەلاکــەو بەیارمــەتیی پــەیژەی بــەزەییی خوداوەنــد بــەرەو قوللــەکانی قــەلا وەســەرکەوت. بڕێکــی لەدڵســۆزانی دەوڵــەت بۆپاســەوانیی دەرکەی قەلاو بورج و بارۆو وارشەکان هەڵ بژارد. خۆیشی هاتەناو ســەرای دەوڵەتەوە، چووە ناو حەرەمسەراوە، لــەکاتێکدا هــەلچڕخانی بــاوکی لەســەر جێگــای حەســانەوە پــاڵی‌دابۆوە،خــان ئەحمــەدخان لەگــەڵ چــەند هــاوڕازێکی خۆی‌دا هەڵی‌کوتایە سەری و چاوی لەمافی باوك و فرزەندی پۆشی و باڵبەستی کردوهەرلەوکاتــەدا لەگــەڵ چــەن یاســاوڵێکی ئــازاو چاونەترســی‌دا ڕەوانــەی ئەسفەهانی کرد. مــەلا یەعقووبیشی لەبەند ڕەهاکردوو دڵنــەوایی‌یێکی زۆری کــرد. پــاش گەیشــتنی هــەڵۆخان بــەدەرباری ســەفەوی ڕێزێکــی زۆری لێ نــراو خرایــە ژێــر ئەوپــەڕی چــاوێری و بــەزەییی پادشــایانەوە. لەکتێبەکــەی خــوا لێخۆش بوو مەلا محەمەد شەریف‌دا بەم شێوەیە باسی کراوە.

هەڵۆخان پاش ئەوەی گەشتووەتە ئەسفەهان بە چەندین جۆر پێشوازو بەزەی شار باری دڵشاد کراوەو تائەو ڕۆژەی مردووە،ڕۆژگاری ژیانی بەوپەڕی ڕێز لێ گیرانەوە بەسەربردووە، بەڵام بەپێی نووسینی خوسرەو بەگی بەنی ئەردەڵان، هەڵۆخان پاش ئەوهەمموو ڕێزوو دڵ ئەوایی‌یە زۆرانەی کەئەمەیش ڕێو ڕەسمی پاد شایانەو ڕەوشتی خوسرەوانەیە بەخەڵاتێکی زۆرەوەیان ناردووەتەوە بۆ وڵاتی خۆی‌و بڕیاردراوە کەهەرگیز دەست لەکاری فەرمان ڕەوایی وەرنەدات‌و دوورەپەرێزی بژی.( خودا هەر بۆ خۆی لە هەموو کاران ئاگادارترە).

لەبارەی جیهانەوانیی خان ئەحمەد
خانی کوڕی هەڵۆخان‌و
کورتەیێك لە سەربردەی ئازایەتی‌و
کەڵەمێردیی ئەو خودانە

چۆن لەساڵی102دا خان ئەحمەد خان بێ ئەشکەنجەو ئازار بووکی وڵاتی بەهەزار نازەوە لەباوەش گرت، شنەی خۆش‌و شادی بەسەر گەورەو بچوکدا هەڵی کرد، بڵندو ئەوی بە بەزەی هەمە تەرزی ئاسوودە بوون، پیاوماقوڵان‌و ژێردەستان سەرلەبەر، لەسای وتفی بێ پایانیەوە، بەوپەڕی شانازی گەیشتن. ماوەیێکی زۆر لەپێناوی کامەرانی‌و خۆش گوزەرانیی خەڵکی وڵاتدا تێکۆشا هەریەکەی بەپێی پلەو پایەی خۆی ئازدەکێشا. خزم‌و بیانی‌لەلێشاوی دەهندەییی بەهرەمەندبوون، داراو نەدارا لەبەرچاوی یەکسان‌و خۆشەویست بوون. تاکاتێکی کەڵکەڵەی وەدەست هێنانی وڵاتی ڕۆمی کەوتەسەر وبە لەشکرێکی لەژمارەی ستێران بەدەر هێرشێکی توندو تیژی بردە سەر تیرەی بڵباسی شەڕخوازو هەڵی‌کردەسەر مەڵبەندی ئەو بەدناکارانەوناوچەیانی داگیرکردو ئاڵای سەرکەوتنی هەڵکرد تیرەی بڵباسیش پاش بیستنی ئەم هەواڵە لەشکرێکی لە ژمارە بەدەری کۆکردەوەو بەهەزار ترس‌و سامەوە دەستیان دایە شیرو تیرو ڕێیان لە خان ئەحمەد خان گرت‌و بەرەو بڕی‌یان لێ‌کرد. سوپای سەرکەوتوی ئەردەڵان لەترسی ئەومیرە وڵات گیرە، بە پێی ڕێو ڕەسمی زگماکی لە خۆ بوردوویی یەکسەر تیغی زاخاودراوی لەکالان هەڵکێشاو بەوپەڕی بێ‌باکی‌یەوە هەڵیان کوتایەسەر لەشکری وەك دەریای بەجۆش‌و خرۆشی بڵباس‌و بەهێرشی مەردانەو نرکەی دلێرانە ئەوسپا لەژمارە بەدەرەیان بەزاند و سەرەنجام زۆربەی سەرۆك ویەکە پیاوانی ئەو هۆزەکوژران‌و چەندین لەوکینە لەدڵ‌و بەدیرانە بەدیل گیران‌و سەر شۆڕکران. هێندێکیش لەوانەی ، لەوتەنگ‌و چەڵەمە پڕ مەترسی‌یە ڕزگار ببون ژیانێکی سەرلەنوێ‌یان وەدەست هێنایەوەو بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕانەوە.
بڵباسەکان ماڵ‌و کۆچ‌و پەیرەوانی خۆیان کۆچ پێ کردو لەجێگاییێکی سەختدا، کەلەکاتی ئەمجۆرە ڕێکەوتنانەدا پەناگایان بوو، جێگیربوون‌و ئەوانەی لەوشەڕەدا بەزیندویەتی مابوونەوە بەرەبڕی یان لەلەشکری ئەبەزی ئەردەڵانی یەکان کردو دەستیان بەشەڕکرد. لەیەکەم هەڵمەتدا چەند شیردێکی ئەردەڵانیان تخیلی زەوی کرد، سەرەنجام ئەردەڵانی‌یەکان هێرشێکی دلێرانەیان بردە سەریان‌و هیممەتێکی پیاوانەیان بۆ تەفرو توناکردنیان نواندو ئەو تیرە شەڕخوازەیان بەجارێ لەناوبردو دوایان بڕینەوە.
بڵباسەکان کەچاویان بەم حەشەو هەنگامەیە کەوت، هەریە هەموو هەڵاتن.
هەرچی دلێرانی ئەردەڵان بوون ئەسپی تیژڕۆیان هێنایە جوڵەو دەسکەوتێکی زۆریان لەماڵو سامانی ئەو بەدمەزەبانە وەدەست هێناو لەوێرا ئەسپی عەزمیان تاوداو تا ئەوجێگە سەختەی خۆیانیان تێدا قاتم کردبوو ڕیشمەیان شل نەکرد. چەندمار ڕۆژی گەمارۆیان دان‌و ڕێی هات‌وچۆو کاروباریان لێ بەستن تا بەم شێوەیە داوێنی دان بەخۆدا گرتن‌و سەبریان لەدەست بدەن‌و واز لە لووت بەرزی بێنن‌و ملکەچی قوبووڵ بکەن. ئەگەر چی دوایی، هێرشەکەیان ڕاگرت بەڵام ئەم ڕوداوە لەهەموو کانگای دڵیانەوە نەبوو. لەبەرئەوەی ڕێگای بەوێ گەیشتنی یەکجار سەخت‌و تووش بووو بواری شەڕوشۆڕیان نەبوو، لەسەرو بەرنانی ئەم کارەدا سەریان سوڕماولەو دەشتەدا سەرگەردان مانەوە. سەرەنجام ڕۆژێکیان کەڵەژنێکی‌جوانی ژیرو زیرەکی ئەو تیرەیە ئارەزووی گەشت‌و سەیران دەکا. دەوروبەری سوپا بێسەنگەرو سوپەر بوو. بەرێکەوت تووشی بوو بە تووشی کاربەدەستی خانەوە لێی پرسی هۆی لێرە هەوارگرتنتان لەبەرچی‌یەو ئەم هەموو خۆنامادەکردنو خۆ سازکردنە لەبەرکێ‌یە؟ کاربەدەستەکە لەوەڵامدا گوتی⊗هۆی هەوارگرتنمان لێرە ئەوەیە ڕێگاویان نی‌یەو ڕێ ڕەوەکە زۆرتەنگەبەرەو بەئاسانی توانی لێوە دەرباز بوونمان نی‌یە. ئەو ئافرەتە شەنگە بەتانووت‌و پلارێکی نازو عیشوە ئامێزەوە، بووبە باوەشێنی بڵیسەی ئاگری توڕەیوو ڕکی خان. هەردەمو دەست فەرمانی ئامادە بونی لەشکری سەرکەوتووی داو چیرۆکی ئەم ژنە نیهاد پاکەی لەنووکەوە بۆسەردارانی سوپا گێڕایەوە. سەردارانی سوپایش دەسبەجێ دەستیان لەگیانی خۆیان شوشت‌و دەستیان بە قلفی توندو تۆڵی فەزڵی خوداوەندی دوو جیهانەوە گرت‌و لاوانی خەنجەر بەدەست بەتێخی ئاودارەوە چاکی ئازایەتیان لێ هەڵکردو دەستیان دایە شیرو ڕم‌و بەیارمەتیی خودای بێ‌هاوتا ڕوویان کردە سەرلوتکەی چیاکان‌و لەنشێوانەوە بەرەو هەورازان هەڵ کشین‌و دەرووی شەڕوشۆڕیان لە ڕووی دژمنان هاویشتە سەرگازی پشت. ئەم تیرە چارەبەدە ئەم هەنگامەیان دیت دەسبەجێ دەستیان بە شەڕکردو بەتەقەکردن‌و گابەرد گلۆر کردنەوەوە تێهەڵچون‌و ئەو دلێرە ڕۆستەم ئاکارانە بە تیخ‌و تیرو تەورەوە خۆیان گەیاندە سەنگەرە بەسامەکانیان‌و نێرو مێیان لەتێخ کێشان‌و پاشماوەی ماڵ‌و سامانیان بوو بەدەسکەوتی ئەوسوپا سەرکەوتووەو لەشکری زاڵ بوو بەدیل‌و یەخسیرێکی زۆرەوە لەوەزیاتر پێ نەچوو بەسەرکەوتن‌و زاڵ بوونەوە گەڕایەوە. فەرمان ڕەوایانی سابلاخ‌و مەراغەو ئەو ناوچانە بەبیستنی ئەم سەرکەوتنانە بێ چەندو چوون بەدیاری‌و پێشکێشی نایابەوە دەستەو ئەزەر ڕویان لە بارەگای کردوو ئەوپەڕی لەخۆبردن‌و خزمەتگوزاری خۆیان نواند. سەرکاری خان ئەوناوچە بەدەست هێندراوانەی یەکە بەیەکە بەرەوڕووی فەرمان ڕەوا دڵسۆزەکانی دەوڵەت کردەوە پاش دوایی هاتنی کاروباری خان لەوناوە، بەسەربەرزی‌یەوەلەڕێگای کۆیەو هەریرەوە بەرەو ڕەواندزو عیمادیە دای کێشا چەند کەسێ لەکوڕانی بارام بەگ کوڕی سورخاپ بەگ کەپێشتر باسمانکردن‌و لەسەردەمی حوکمڕانیی باوکی‌دا فەرمانڕەواییی ڕەواندزو عیمادی‌یەیان پێ سپێردرابووو بە هۆی ناسازی ڕۆژگارو چارەنووسی پەروەردگارەوە لەفەرمان ڕەوای کەوتبوون‌و پەست‌و سەرشۆڕ ببوون، بەبەزەیی‌و نوازشتی خوسرەوانەیەوە کۆی کردنەوەو دووسێ کەسێکی لە سەرۆکەکانیان لەسەر تەختی فەرمان ڕەوای جێگیر کرد. لە ئاکامی بارانی بەزەیەوە چیمەنی دوواڕۆژیان گەشەی‌کردو لەسای‌لێشاوی چاودێرییەوە تەلاری‌یە شان‌و شکۆیان ئاوەدانبۆوە. هەروەها ڕەواندزی بە قەرەحەسەن بەگ‌و خۆشناوی بە خالید بەگ‌و عیمادی‌یەی بەعوسمان بەگ یسپاردو لەسەر تەختی‌حوکمڕانیی چەسپاندن‌و ژەنگی پەستی‌و خواریی لە ئاوێنەی دەوڵەتیان سڕی‌یەوە.
لەبەرئەوەی حەسەن بەگ لە ڕووی شۆخ‌و شەنگی‌و دلێری‌یەوەو لە ئاکار پەسندی‌و فەزڵ‌و کەماڵ‌و ڕەوشتی مەردایەتی‌و ئازایەتی‌دا لە سەرووی ئەوانی دیکەوە بوو، خەڵات کراو بەسەرکردەی ئەو هۆزو تیرەیە هەڵ بژێردراو بەگەورەیی خۆی فەرمانڕەواو سەرلەبەری ئەو بنەماڵەیەی خەڵات کردو تائیمڕۆکەیش کەساڵی1262کۆچی‌یە فەرمان ڕەوایانی ڕەواندز وەچەی ئەون دەگێرنەوە، تیرەی حەمەڕەشید بەگی وەکیل بە ڕەچەڵەك لەچەند سەرێکەوە، دەچێتەوەسەر خالید بەگی میری خۆشناو لە سەردەمی فەرمانڕەواییی خان ئەحمەد خان‌دا هێندێکیان هاتوونە کوردستان و بە پلەی وەکیلی سەربەرز

کراون. پاشی‌ئەوەی خان ئەحمەدخان کاروباری ناوچەی بڵباسەتی‌و ڕەواندزو عیمادی‌یەی سەروبەرناو ئاسوودەو سەرسووك بوو، بڕیاری‌دا هەڵکاتەسەر تیرەی داسنی‌و خالیدی. کاتێ گەیشتە نزیکی وڵاتی ئەم تیرەو هۆزانە یەکسەر لەم هەڵکردنە سەرە ئاگاداربوون‌و زۆرپیاوانەو بەوپەڕی ئازایەتی‌و دلێری‌یەوە هۆەزکانی خۆیان خڕکردەوەو بڕیاری شەڕیاندا. هونەروەرانی ئەردەڵان وەك سەمەندەر بەرەو ئاگر هەڵیان کوتاو ڕیزیان تێك‌و پێك شکاندو لەیەکەم هەڵمەتدا بنەڕەتی بوون‌و توانیان لەبێخ‌و بنیچەوە لەبەریەك هەڵتەکاندن‌و هەرچیەکیشیان ڕزگاربوون بەم لاو بەولای وڵاتدا ئاوارەبوون‌و پەرت‌و بڵاوبوونەوە، یەك سەلەفانی مەیدانی ئازایەتی بە یەغبالی ڕوونەوە شەوو ڕۆژێ وەدووی داسنی‌و خالیدی کەوتن‌و دیل‌و بەرزە وڵاخ‌و سامانێکی زۆرو زەوەندیان لێ وەدەست هێنان‌و زاڵبوون‌و بەسەریاندا سەرکەوتن. هەر لەوشوێنەوە خان هەمەکارانی بەرەو کۆیەو هەریر ناردو خۆیشی بەسەرکەوتنەوە بەرەوموسڵ چووو ئاوازەی هاتنی لەشکری بەگوێی فەرمانڕەوای مووسڵ گەیشت. ئەویش کە بەمەی‌زانی پەشۆکا. نەی توانی‌بەرەو بڕی لێ بکا ، ناچار بۆ حەڵەب هەڵات. پیاوماقووڵان‌و سەرۆکانی مووسڵ بەدەس‌و دیاری یەکی زۆرو گرانبایی‌یەوە چوون بۆ خزمەتی ئەومیرە وڵات گیرەو سەری گوێ بەفەرمانی‌و ملکەچی‌یان بۆدانەواندو خانیش زۆری ڕێز لێ گرتن و یەکەیەکەیانی بەخەڵاتی گران بایی خەڵات کردوو سەری بڵیندکردن و لەتەك فەرمانڕەوای تازەیاندا گەڕانەوە بۆجێی خۆیان. دەس‌ودایەرەی خانی سەرکەوتوو بێهیچ کۆسپ‌و سەرشۆڕی، بێهیچ بگرەوبەردەیێ ناوچەکەی بەپێ‌و قەدەمی ڕازاندەوەو بەدیدەنی‌و زیارەتی یونس پێغەمبەر شەرەفمەندو بەهرەدار بوو. نامەی سەرکەوتنی بەهەموو لایەکدا بڵاوکردەوەو خۆیشی لەومەڵبەندەدا چل ڕۆژێ مایەوە. پاشان فەرمانی بۆخەڵکی مووسڵ دەرکرد، کە کارگەران‌و دەس‌و پێوەندانی خۆیان بنێرن خەلەوخەرمانی حەسەن ئاباد بکوتن‌و دانەوێڵەکەی خڕکەنەوە. کەلەوڕۆژانەدا سەربازەدلێرەکان، پاش ڕێکردنێکی زۆرو ماندوبوون خۆیان‌و ئەسپ‌و وڵاغەکانیان پشوویەکی چاك بدەن‌و تێکڕا سەر ئاسوودە بن . ئەوجا فەرمانی بە میرزاو نووسیارانی‌دا، ڕووداوی ئەم سەرکەوتنەو ڕاستیی ئازایەتی‌و بوێریی لەشکری ئەردەڵان بە دووروودرێژی لە دەرباری ئەسفەهان ڕابگەیێنن . سەرەنجام ئەحمەد خان لە لایەن دەرباری ئەسفەهانەوە بە پشتوێنی گەوهەردارو ئەسپی ڕەسەن‌و چەك‌و زینی زێڕین خەڵات کراو دنە درا، بەغدا داگیرکا. خان ئەحمەد خانیش پاش سەروبەرکردنی باری ئەو ناوچانەی بە دەستی هێنابوون، لەشکری کردە سەر ناوچەی کەرکوك‌و قەڵاکەی. هەرچی تیرەو هۆزی ئەو ناوە هەبوون سەرلەبەری خستنە ژێر قەڵەمڕەوی خۆی، تا گەیشتە دەورووبەری بەغدا. بەغدا ئەگەر چی شارێکی یەکجار ئاوەدانەو قەڵایەکەی زۆر سەخت‌و دژوارەو نیشتەنی‌یەکانی لەوپەڕی توان‌و ئامادەیی‌دان، بەڵام گرتنی لە سەردەمی هیچ کەڵە پاتشایێکی تاجداری ئازاو گەڕناس دا سەری نەگرتووەو هەرگیز ملی بۆ کەس نەداوە ئەوەندە هەیە، لەو سەروبەندەدا ، چونکە دەبدەبەی ئازایەتی‌و کەڵە مێردیی ئەو کەڵە مێرە بەرگوێی پیرو لاو کەوتبوو، خەڵکی بەغدا وێڕای ئەو هەموو توان‌و خۆتەیارو ئامادەکردنە ترس‌و سامێکی لەکێش بەدەری ئەو خودانە خوسرەونەژادەیان چووبووە دڵەوەو هەرچەندیان دەکردو دەکراند، زاتیان نەدەکرد بەرەنگاری بن‌و لێی‌ڕاسێن. هەروەکو لە سەرەتاوە بە هەزار ترس‌و دڵەلەرزەوە هێرشێکیان برد، بەڵام زۆری نەبرد وازیان هێناو ملی ڕێك کەوتنیان دا.

بە پێی نووسینی مەلا محەمەد شەریف، دەروێش محەمەدبەگی سوباشی بە غدایی، لە دڵی خۆیدا مەیلی مل کەچی هەبووە، لەبەر ئەوە، ئەم ڕێك کەوتنە بوو بەهۆی دڵ بەهێز کردنی سەربازانی ئەردەڵان‌و پاڵپشتی بۆ سوپاکەی‌و بەم جۆرە چوونە ناو قەڵای بەغداوە. لەبەر ئەوەی کە خەڵکەکە حەزیان لە شەڕ نەبوو شەڕکردنیان لە بەرژەوەندی خۆیان نەدەزانی‌و سەر سەپێچیان بە مایەی سەرلێشێوان‌و لەناوچوونی خۆیان دەزانی بۆ ڕێك کەوتن هاتنە پێشەوە. کە تخوداو خاوەن پلەو پایەکان‌و گەورە پیاوان بە دەس‌و دیاری‌یەکی زۆر گرانبایی‌یەوە هاتنە خزمەت‌و گوێ بەفەرمانی‌و مل کەچیی خۆیان لە ڕاستی دەربڕی. پاش ڕەزامەندیی هەردوولاو شەڕو شۆڕ کوژانەوە والیی (دار السلام) بە خزمەتی جەنابی خان گەیشت‌و تانوپۆی دڵسۆزی‌و یەکدڵی خۆیان لێك ڕایەڵ کردو چەندین ئەسپی کەحێلەی ڕەسەنی عەرەبی‌و کەلوپەلی زۆری گرانبایی‌و چەندین جۆر دەست‌و دیاری‌یان پێشکەش بە خزمەتی کرد. ئیتر بەم جۆرە سەرکێشی‌و یاخیتی بە گوێ فەرمانی‌و مل کەچی گەڕاو ئاشتی جێگای ناکۆکی‌و کێشەوبەرەی گرتەوە.هەر بۆ سبەینێ ئەو ڕۆژە میری بەختەوەر بە خۆشی‌و شان‌و شکۆو دەبدەبەو سەنسەنەوە تەشریفی گەیشتە (دار السلام)ی بەغداو ئەو سەر زەوی‌یە پیرۆزەی بەفەڕی پی‌و قەدەمی خۆی شەرەفمەند کرد. لەو کاتەدا وەزیری بەغدایش چەندین پێشکێشی شایانی بو خزمەتی هێناو لەگەڵ ئەمیران‌و بەر پرسانی دەوڵەتیش دا کەوتنە چاك‌و خۆشی کردنێکی گەرم‌و گوڕ. پاش چەند ڕۆژێ کە دەستی لە کارو باری بەغدا بەتاڵ بوو بە هەموو ئامانجێکی خۆی گەیشت، بەرەو ئەردەڵان گەڕایەوەو پیرو لاوی بە پێی‌و قەدەمی پیرۆزی شادمان‌و دڵخۆش کرد. مێژوونووسان ماوەی



ئەم سەفەرەیان بە حەوت ساڵ لە قەڵەم داوە. هەر کە دەنگ و باسی گرتنی بەغدا بە شاعەباس گەیشت، شا لەو بنەماڵەیە بەژن و ژن خوازی نزیک بوونەوەی بە مایەی شانازی و شان و شکۆ بەرز بوونەوەی خۆی زانی و سەرلەنوێ بەدەس و دیاری گرانبایی و خەڵات و نوازشت دەربڕینی دڵسۆزانە پایەو نرخی هێندەی دیکە بەرزکردەوە. ئەویش بەوپەڕی توانییەوە فەرمانڕەوایی ی، بە نارەزووی خۆی، لە وڵاتی پشتاوپشت بۆ بەجێماوی ی دا بەڕێوەدەبرد، تا ئەو ڕۆژەی کە شا عەباس فەرمانی خودای بەجێ هێناو بەپێی گوتەی خودای گەورە ((کل من علیها فان ویبقی وجه ربك ذو الجلال والاکرام) گیانی بە بەهەشتی بەرین شاد بوو شا سەفی جێگای ئەوی گرتەوە. شاسەفیش هەر لەسەر ئەو ڕەوشت و ڕێ و ڕەسمەی باوکی لەسەری دەڕۆیشت لەگەڵ خان ئەحمەد خان دا مایەوە. هەروەها سورخاب بەگی کوڕی خان ئەحمەد خان کە گەوهەری بوو لە سەدەفی زەڕین کولاه دەرچوو بوو ولە باوەشی شا عەباسدا گەورە ببوو لەسەر یاسای کۆنی باوکی خزمەت و هاودەمیی شاسەفیشی لە ئەستوگرتبوو. شاسەفی چونکە نیشانەی زیرەکی و زانایی تێدا بەدی دەکرد دڵی لێی کرمێ بوو کەڵکەڵەی لەناوبردنی کەوتە کەللەوە، تا ڕۆژێ شا وێردیخانی لوڕ کە پێشتر باسمان کرد، (بەیارمەتی عومەر بەگی کەلهوڕ لە شەکری کردە سەر تەیمورخانی مامی خان ئەحمەد خان و نێوان هەردوو بنەماڵەکە لەنوێ ژەنەوە تووشی کێشەو دووبەرەکی بوونە) شاوێردی خان چونکە ڕک و کینەی کۆنی لەدڵدا هەبوو، لەم سەردەمەدا هاتە خزمەتی شا سەفی، پاش وتووێژێکی دوورو درێژ لە هەموو بابەتی مەسەلەکەی خستە دەستی شاوێردی خانەوەو داوای ڕاوتەگیری لێ کرد. ئەو بەدبەختە بەدکارە، کە هێشتا تاڵاوی شمشێری ناوداری دلێرانی ئەردەڵانی لەزاردا مابوو، پێی گوت، سورخاب بەگ لاوێکی ئاکار پەسەندەو تا بڵێی پیاوەو خاوەن ئەقڵ و ئاوەزە، چەندی وی ژێرو وشیارە، سەرباری ئەمەیش باوو باپیرانی دەستی دەسەڵاتیان لە زۆربەی وڵات و ناوچەکاندا درێژبووەو خۆیان بەسەروەرو خودان زانیوە، تەنانەت ئەگەر خۆی بەخاوەن هەق و ماف بزانێ بەندو بارێکی لەگەڵ سەڵتەنەت و خیلافەت دا بوویەتی، هەقیەتی و بەجێ یە. لەبەر ئەوە دەبێ بەهەر نرخێ بێ تازووەو دەرفەت لەدەست نەچووە، بەلاوێتی لەناو ببرێ. ئەم ئەفسانەیەی شاوێردی چوو بە مێشکی شاوەو دەسبەجێ فەرمانی چاو هەڵکۆڵینی داو میرغەزەو بێ سێ‌دوو چاویان هەڵکۆڵی و پیشانی شایان دا. پاش چەند ماوەیەیی ئەم خەبەرە شوومە گەیشتە خان ئەحمەد خان، پەنا بەخوا خان ئەحمەد خان لە ژیان بێزار بوو بەدەم ئاخ و ئۆف و ناڵەو فیغانەوە نارام و ئۆقرەی لێ بڕابوو خەوی لە چاو نەدەکەوت و لەوەسفی ئەو نووری چاوەی دا ئەم چەند بەیتەی گوتووە.

بی تۆ ئەی گیانی جیهان بەم دڵی خوێناوی یەوە چ بکەم! لەتاو
بی چاویی تۆ ئەی چاوی دنیا بێ چ بکەم!
بێ گوناه چاویان هەڵکۆڵێت
کوێراییم دایە بڵێ منی بیچارە چ بکەم؟

سەرەنجام بە نەخۆشی و سەوداو ماخۆلان گرفتار بوو ماوەی ساڵێکی ڕەبەق سەرەڕای هەزار داودەرمان و پزیشک و پزیشک کاری هیچ چارەسەرێکی نەبوو. تەنانەت کار بەڕادەیێ گەیشت ناچار کۆت و سندمیان کرد. دەگێڕنەوە، ئیسماعیل بەگی عینایە تولڵابەگ کەلەو سەردەمەدا بە پلەو پایەی وەزیر گەیشتبوو بە ڕاوتەگیری جوانی. لەو ماوەیەدا خان لە کۆت و زنجیردابوو. ئەو کاروباری وڵاتی دەگێڕاو هیچ کەم و کوڕی یەک نەدەکەوتە کاریەوە. تا پاش ساڵێک بە یارمەتی خودای گەورە خانی مەزن چاک بووەو بەخۆهاتەوە.

شاعیران مێژووی نەخۆش کەوتنی خانیان بەحیسابی ئەبجەد بەم تاکەشیعرە تۆمارکردووە: ((در غلگ گشت ایلەو مجنون)).
پاش ئەوەی لەم بێ هۆشی یە بەهۆش هاتەوە جارێکی دی دڵی بۆ کارەساتی کوڕەکەی بەجۆش هاتەوە، ناچار سەرپێچی لەشا سەفی کردو لەگەڵ سوڵتانی ڕۆم دا ڕێک کەوت و لە ئێران دەستی بەتالان و بڕۆ کردو هەرچی یەکی لەو وڵاتانە وەگیر دەکەوت دەی دایە هاوسەنگەرانی خۆی. خان ئەحمەد خان کرماشان و هەمەدان و گەرووس و ڕووس ورمی و سەنقەری گشت خستە سەر قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی و هەرچی ناوچەکانی دەوروبەریش بوون سەرلەبەری تالان کرد هەر کە ئەم هەواڵە بەشا سەفی گەیشت. زاڵ خان و سیا وەش خان کە هەردووکیان لەشاوە نزیک بوون، کران بە سەرکردەی سوپایەک لە هەڵمەت و ئەبەرددا وەک شەپۆلی جەیحوون و لە بێ شوماری دا لە پێکوڕەو مێروو زۆرتر بوو بۆ لە ناوبردنی شەڕی خان ئەحمەد خان. خان ئەحمەد بەبیستنی ئەم هەواڵە بەجارێ ڕێگای سەرپێچی گرتبەرو لەشکری خۆی خڕکردەوەو خەبەری لەشکر کێشی شای ئێرانی ڕاگەیاند دەرباری سوڵتانی عوسمانی داوای کۆمەک و یارمەتی کرد. لە لایەن پادشای ڕۆمەوە مەنوچەر خانێکی بەیاریەوە هات. پاش ڕێگاو بان بڕینێکی دوورو درێژو چەندین قۆناغ هەردوولا لە کن دەریاچەی مەریوان کە هەمیشە شوێنی شەڕو لێکدانی ئازایانی ئێران و ڕۆم بوو، دەگژیەک ڕاچوون. ئەو دوو لەشکرە گەورە و گرانە بەتوندو تیژی خرۆشان و بانگی (ان زلزله الساعة لشیء عظیم)) بەرگوێ کەوت و شێرانی بێشەی ڕکوکین دەستیان دایە شیرو تیرو هەڵیان کوتایە سەر یەکتر. لە یەکەم هێرشدا بێ گوناهێکی زۆر لە هەردوو لا سەریان تێ‌داچووو سوپای قزڵباش شکستیان هێناو هەڵاتن. ئێرانی یەکان کە دیتیان سوپای دوژمن لە پشتیانەوەیەو زۆنگاو زەمەندی مەریوان لەپێشیانەوەیەو خۆ لە ڕەو شمشێری پاڵەوانانی مەیدانی شەڕ بواردن کارێکی لەکێش بەدەرەو ڕێی هەڵاتنیان نی یەو لەو تێ‌دا چوونە ناتوانن خۆیان ڕزگار بکەن، ناچار بەتەگبیری زاڵ خانی سەردار دەستیان لە گیانی خۆیان هەڵگرت و شمشێری کین و تۆڵەیان لە کالان دەرکێشاو هەڵیان کردە سەر سوپای خان ئەحمەد خان و لەشکری ڕۆم. لەبەر ئەوەی سەرکەوتن بەدەست خودای گەورەیە، شنەبای سەرکەوتن ئاڵای ئێرانی یەکانی شەکاندەوەو سوپای ڕۆم و لەشکری خان ئەحمەد خان وێڵ و سەرگەردانی هەڵدێری پەرێشانی بوون هێندێکیان بەهەزار فرۆفێڵ سەری خۆیان ڕزگار کرد. سەرئەنجام لەشکری ڕۆم بە سەر شکاوی گەڕایەوەو خان ئەحمەد خانیش لەگەڵ بڕێ لە خەڵکی کوردستان ڕەوانەی موسڵ بوون و هەر لەو ساڵەدا فەرمانی خودای بەجێ هێنا.
هەڵبەست

حەیف بۆ لاویی ئەو شێرە پیاوە
بۆ زۆری بازوو و بۆ دەست و بردی
ئێستاش ئەم زانی نابینی ئەم گێتی یە چی یە؟
کەسی بە ئەمری تێ‌دا نەژیا.

بە ڕاستی میرێکی ئازاو دلێرو وریاو خودانێکی بەداوو دەس بڵاو بوو. بە ئاکاری جوان و ڕازاوەو بە ڕەوشتی پەسەند ناسرابوو. تا بڵێی پیاوێکی بەسەلیقە بوو. دەگێڕنەوە: جل و بەرگی کوردەواری کە یەکێ لە جل و بەرگی پیاوانەیە، داهێنانی دەستی ئەوە دەڵێن یەکێ لە جۆلاکانی ئەسفەهان پارچە شاڵێکی پێشکەش بە سەرکاری پاتشا کردبوو، چون خان ئەحمەد خان لەو شوێنەدا حازر بوو دایانێ ئەویش بە سەلیقەی خۆی کوردەواریانە هەڵی دووری و لەبەری کردو هاتە خزمەتی شاو هەزار جاریان ئافەرین لێ کرد.

سەرچاوە: مێژووی ئەردەڵان.. نووسینی ماه شەرەفخانمی ئەردەڵانی (مەستوورە) وەرگێڕانی، شوکر مستەفاو د.حسین جاف

# چەند نمونەیەك لە شیعرەكانی (مەستوورە)
## لە دیوانی مەستوورەی كوردستانی
## 'كۆكردنەوەو ساغ كردنەوەی صدیق بورەكەیی (صفی زادە) وەرگیراوە

### بەقوربانی مالی تاریکت بم

سا خۆم بەقوربان تاریکی یانەت
ئەو ماوای دەیجور چۆڵو ویرانەت
چە زبان لاڵ بام وێنەی نەقش سەنگ
پەی چێ جات گرتەن تۆ قەور تەنگ؟
مەر فەڵەک کەردەن دەستاخت بەی تەور
بیەن وەیارت سەنگ سیای قەور
نمەکەری یاد تۆ جە یارانت
نمە پەرسی حاڵ دۆس جارانت[1]
یا خۆ خان مەرگ زیندانیت کەردەن
یا عەهدو وەفا جەیادت بەردەن
یا مەیل ئامان خەڵوەتت نیەن
یا جە غوصصەی وێت نەویرت نیەن
بەگیانت خەسرەو، کام نەدیدەی دەور!
دەستاخ زەنجیر کەردوون پڕ جەور
پەی تۆ نەخەڵوەت، نەباغ نە وڵات
نە تۆپ نیظام، نە سانو سپات[2]
موطلەق قا هیچ کام بە وێنەی جاران
جەدمای سەردار صەفا نەداران
دەستەی غوڵامان صاحیب ئیخلاصت

صەداقەت کاران فیدەوی خاصت
مەگێلان وێڵ وێڵ، بێ ئاغەو بێ یار
ماتو سەرگەردان، دەلیلو زگار
هەریەک وە دەردێ گرفتار بیەن
سەر رشتەی کارش جە دەسش شیەن
مەنالان جەسای چەرخ واژگوون
جە بێ ئاغایی وە دڵەی پڕ هوون[3]
شیوەنو زاریو شینەن کارشان
وا وەیلان سەخت، پەی سەردارشان
جەی یاران سێ کەس وەفا کەردشان
جە هەم قەطاران سەبەق بەردشان
ئافەرین لێشان نمەک شناس بین
جە سەیر دنیای پڕ مەکر هەراس بین
جە دمای خەسرەو صاحیب شکۆو فەڕ
پەی خزمەتش کەس نەبەستەن کەمەر[4]
ئەوانیچ ئاکام بە دڵ تەنگەوە
سەر نیان وەسای سیای سەنگەوە
جە ماڵو دەوڵەت، وەشی دەس کێشان
شین بین وە مۆنیس خەسرەو وێشان
کولاه فەرەنگی بێ صاحێب مەندەن
خەم ڕیشەی شادیش جە بێخ هۆر کەندەن
مەزارۆ؛ پەی بەخت سیای وێش، تەلار



نەیوش نەگوش صەدای مۆسیقار
اخەسرەویتا بی صەبر، ئارامو خەوەن
پەشێوەیش جەداخ مەرگ خەسرەوەن(5)
کتابخانەت چۆڵ بێ زەوق و شەوقەن
بێ دەماغی ئەو جەگشت مافەوقەن
خەڵوەت و دەروون ئەر بالآخانەن
جە دمای خەسرەو، ماچی وێرانەن
لاڵ بام زەمزەمەی جارانت نیەن
بیسات نیشاط یارانت نیەن
صەدای کێشکچی صوبح و ئێوارت
خامۆشەن نە دەور قەصرو تەلارت(6)
یا شا کوردستان، یەکسەر دمای تۆ
ریشەش بەربەیۆ چون خاک نەی کۆ
بواروش پێدا، بەرقێ نەی وەهار
هەنێ کەسێ لێش نەوینۆ ئاثار
وێنەی دەماوەند مەلوول بۆ جەتەم
کەس سەیرو، صەفاش نەوینۆ وەچەم
باقی تا ئەو ڕۆ عومر بەرجام بۆ
شەرط بۆ پەی خەسرەو هەر واوەیلام بۆ
تا خالق گێرۆ دیوان مەحشەر
شین امەستورە[7] جە شیرین بەتەر

(1)واتە: خۆم بە قوربنی ماڵی تاریکت و ئەو شوێنە تاریکەی چۆڵ و وێرانەت بم. وە کوو نەخشی بەرد لاڵ بم، لە بەر چی لەم گۆڕە تەنگەدا جێت گرتووە؟ مەگەر چەرخی گەردوون بەم جۆرە بەندتی کردووە: کە بەردی ڕەشی گۆڕەکە بووەتە یارت، لەبەرچی یادی یارانت ناکەیو حاڵی دۆستانی جارانت ناپرسی؟

(2)واتە: یاکوو خانی مەرگ زیندانی کردووە، یا بەڵێن و ئەمەگی لەبیرت بردووەتەوە، یا ئارەزووی هاتنی ئەندەروونت نیە، یا لەبەر خەمو پەژارەی خۆت ئەمانەت لەبیر چووە؟ بەگیانت قەسەم ئەی خەسرەو، بەندەی زنجیری گەردوونی ستەمکار، تۆی خستووەتەوە داو، ئەندەروون و باخ و تۆپ و تۆپخانەو سپاو سانت

(3)هیچکامایانی وەکو جاران لە دوای سەردارو سەرۆك جوانی ییکی، دەستەی خولامە دڵسۆزەکانت، ئەوانەی وا ڕاست بێژن، ئێستاکە بە ئاوارەیی و بەبێ ئاغەو یار، ئەگەڕێن مات و سەرگەردان و زویرن و هەر کام وە دەردێك گرفتار بوون و سەر رشتەی کاریان لەدەست دەرچووەو لە دەستی چەرخی چەواشە لەبەر بێ ئاغەیی بە دڵێکی پڕ خوێن ئەناڵن.

(4)کاریان هەر شین و شیوەن و گریان و واوەیلایە بۆ سەردارو سەرۆکیان، لە ئەم یارانەت سێ کەسیان بەڕاستی ئەمەیان نواندو ئافەرینیان لێ بێ بۆ ئەمەگداریان، کە لەسەیری دنیای پڕ فروفێڵ وەرەز بوون، لەدوای خەسرەوی خاوەن شکۆو فەر، بۆ خزمەتی کەس کەمەریان نەبەست.

(5)ئەوانیش بەناکامی و بەدڵی تەنگەوە، سەریان نایەسەر بەردی ڕەشەوە، وە لە جوانی و خۆشی دەوڵەت دەستیان کێشاو هەر سێیان ڕۆیشتن و بوونە هاودەمی خەسرەوی خۆیان. ئێستاکە خەم ڕیشەی شادی و خۆشی لەبنەوە هەڵکەندووە، بۆ بەختی ڕەشی خۆی ئەگری، ئیتر دەنگی مۆسیقای نایێتە گوێ، پەشێوی و پەرێشانی ئەو بۆ مەرگی خەسرەوە.

(6)واتە: ئەی خەسرەو، پەرتووکخانەکەت ئێستا چۆڵ و هۆڵە، ئەندەروون و بالآخانە لە دوای خەسرەو ئەڵێی وێرانەیە. لاڵ بم دەنگی جارانت نیە، وە بساتی خۆشی یارانت نیە، دەنگی کێشکچی بەیانیان و ئێوارانەت لەدەوری کۆشك و تەلاردا نایە.

ئەی شا! کوردستان لەدوای تۆ ببێتە خاك! وە هەورە برووسکەییکی وای تێ کەوێ کە سێك شوێنەوارێکی ئیتر لێوە نەبینێ، وەکوو دەماوەند تەم دایگرێ و ئیتر کەسێك سەیرو خۆشی تێدا نەکا، مەرجبێ بۆ خەسرەو هەر لە شین و ڕۆڕۆدابم، وە تا خوای مەزن دیوانی ڕۆژی پەسلان پێك دێنێ، (مەستوورە) هەر شین و شیوەن ئەکا، خراپتر لە شیرین بۆ خەسرەو ئەگری.

## خەسرەو بەهارە

خەسرەو وەهارەن، خەسرەو وەهارەن
کۆربام جەدیدە، فەصل وەهارەن
مەوسم جلووس گوڵ گوڵزارەن
وادەی تەماشای سەیرو شکارەن
یە وەخت تەفریح قەلب و دەماغەن
فەصل ئارەزووی گوڵگەشت باغەن
قەهقەهەی کە بکەن نەسەر کەلاوان
فەضای چەمەنەن، شاخەی شە تاوان[1]
ئەوەڵ خەیمەی، ئەلوان گوڵەن
ئیبتیدای سۆزش ناڵەی بولبولەن
صەحراو باغ خەلآت ڕەنگاو ڕەنگ پۆشان
عەندەلیب بادەی عەشق گوڵ نۆشان
غونچەی گوڵ سورخ نەصەحن چەمەن
وە خەندەی غورور واز کەردەن دەهەن
دیدەی نەرگسان پڕ جە خومارەن
زینەت ئارای بەزم خان وەهارەن
موسەلسەل گێسووی پڕ جەعد سونبڵ
لە رزانەن بە ناز پەرێ دام دڵ[2]
شەوبۆ، کۆساران کەردەن موعەططەر
صەف پێکان نەپای سیس عەنبەر
هەر یەک وەرەنگێ بەر ئامان وەبەر
خودسازی کەردەن پەی تەماشاکەر
زومروو دگوون کەردەن، بەرگ درەختان
پەی کۆری دیدەی قەلآخی ڕەختان
ئەرچەمەن، وەرباغ، وەر صەحراو دەشتەن
ماچی نموونەی صەحرای بەهەشتەن
بلبل وە ئاواز غەم زدای دڵ بۆ
مەوانۆ وە عەشق دیدار گڵ بۆ
قومری وەش دەماغ فەصڵ سەروانەن
چنار فاختەش پەی نەوا خوانەن[3]
بەی تەورە، ئایین بەزم وەهارەن
وەصاڵ مورغان کە یەک و هەزارەن
ئەمما بە گیانت شای لاڵ کەمەرم!
جەی دەم دا بێ تۆ وێم زام خەطەرم
کۆربام جەدیدە شای فەرەیدوون فەر
ئیمساڵ کێ کەرۆ سەیر دەشت و دەر؟
کێ مەشغوڵ وە سەیر کۆ و صەحرا بۆ؟
کێ سەراپەردەی عەیش وە پا بۆ؟

ناڵەی نەواوی کێ بەبۆ نە باخان؟
کێ کەرۆ نەصەحن چەمەن چراخان؟[4]
کێ نۆشۆ نە پای درەخت گوڵ مەی؟
کێ گۆش بدەرۆ بە ئاهەنگ نەی؟
پەی تەماشای باخ کێ بکەرۆ عەزم
نە (خەسرەو ئاباد) کێ بگێرۆ بەزم؟
موطریب پەرێ کێ بنوازۆ سازان
کێ بدەرۆ فیکر بە رێزەی ڕازان؟
گوڵان وەهار کێ بکەرۆ بۆ؟
هانا وە بەختم وەی وەیانەم رۆ!
ناڵەی بەزم کێ گۆش بکەرۆ کەڕ
کێ نیشۆنە تۆی خەلوەت مەنظەر؟[5]
کێ (نەفیردەوس)ی سپاو سانش بۆ
کێ زەمزەمەی عەیش نە دەورانش بۆ
کێ بەزم شادی نە (کارێز)اش بۆ؟
کێ هەوای گوڵگەشت (باوەرێز)اش بۆ؟
ئومێد وە حەضرەت دانای بێچوون بۆ
پەرێ ناکامیت دنیا نگوون بۆ
(مەستوورە)! کۆربای خەیاڵت خامەن
خەسرەوت دەستاخ وە بەندو دامەن[6]

(1)واتە: ئەی خەسرەو، یاخوا چاوانم کوێر بێ کە تولێرەدا نیت، ئەوا وەرزی بەهارەو کاتی دانیشتنی گوڵ لە گوڵزارەو وادەی تەماشای سەیرو شکارە. ئەمە وەختی ڕابواردنی دڵو مێشکەو وەرزی نارەزووی گەشتو سەیران لە باخ دایە، قاسپە قاسپی کەوان لەسەر لووتکەو کلاوەکانی کێوە وە دێ وەچیمەنو مێرگ بە جاری ڕازاوەتەوەو ئاوی شەتاوەکان هاژەی دێ.

(2)واتە: سەرەتای خێوەتی گوڵانی ڕەنگاو ڕەنگەو سەرەتای ناڵەی بولبولە. دەشتو باخ بە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ داپۆشراوە، وە بولبول بادەی ئەوینی خواردۆتەوە خونچەی گوڵی سوور لەناو چیمەن دا، پێکەوە دەمی کردووە، وە نێرگسان چاویان پڕ لە خومارەو بەهاریان بە جارێ ڕازاندۆتەوە ڕوەکو گیاکان بەدەم شنەی باوە ئەلەرێنەوەو بۆ داوی دڵ نار دەکەن.

(3)واتە: شەوبۆ کۆسارانی بۆنخۆش کردووەو لە بەردەم سپای گوڵی سیس عەنبەردا ڕیزیان بەستووە، وە هەر کام بە ڕەنگێ هاتووەنەتە بەرو خۆیان بۆ تەماشاکەران ڕازاندوەتەوە، وە گەڵای داران دەشتو دەریان زومروودی کردووە، چیمەنو باغو دەشتو چۆڵ ئەڵێی بەهەشتە، بولبول ئەچریکێنێو ئاواز ئەخوێنێو خەمو پەژارەی دڵ ئەباو لە خۆشی گوڵ دا گۆرانی ئەڵێ، قومری خۆش دەماخ لەم وەرزەدا ئاواز ئەخوێنێو کۆترە باریکە لەسەر چنار ئەوخوانی ئەکا.

(4)بەم چەشنە بەزمی بەهارەو کەوانو هەزاران بەیەك ئەگەن، بەڵام ئەی شای کەمەرلاڵم، سوێند بەگیانت لەم دەمەدا بەبێ تۆ دڵو دەروونم بریندارە، ئەی شای فەرەیدوون فەڕیاخوا کوێر بم، ئەمساڵ کێ بەبێ تۆ سەیری دەشتو دەریکا؟ وەکێ بچێتە کێوو دەشتو سەراپەردەی بەزمی پێك بهێنێ؟ ناڵەی ئەوای کێ لە ناو باخان دا بێتو کێ ناو چیمەن چراخان بکات؟

(5)واتە: کێ لەی داری گوڵو مەی بخواتەوەو کێ گوێ بداتە ئاهەنگی شمشاڵو بۆ تەماشای باخ کێ بکەوێتە ڕێو لە خەسرەو ئاوا کێ بەزم بگێڕێو چاوەش بۆ کێ لێ بداو کێ گوێ بداتە بیرورای ئەوان کێ بۆنی گوڵانی بەهار بکات؟ بەدبەخت خۆمو هاوار بە ماڵم، ناڵەی بەزمی کێ گوێ کەر بکاو کێ لە شوێنی تەریکدا دانیشێ؟

(6)واتە کێ لە (فیردەوس) دا سپاوسانی بیو کێ لە دەوران دا ڕابوێرێو کێ لە (کارێز)دا شادی بکاو کێ بیەوێ لە دوای تۆ لە (باوەرێز)دا خەریکی گەشت بێ. ئومێدم بە خوای گەورەو گران کە بۆ ناکامیت دنیا لەناوچێ. ئەی مەستوورە کوێربێ، خەیاڵت خاوە، خەسرەوت ئێستاکە لە گۆڕدا بەند کراوەو لەداوە.

ئەم هۆنراوانەی مەستوورە باوە کوو لە ڕواڵەتا لا واندنەوەی خەسرەو خانی ئەردەڵانی‌دا، وێژراوە، بەڵام ئەگەر چاك وردبینەوە، لە ڕاستەقینەدا پارچە بەهارێکی جوانو دڵ ڕفێن کە بێ گومان کەمتر کەسێ لە هۆنەرە پایەبەرزەکانی وێژەی کوردی توانیویە، پارچە هۆنراوێکی بەهاری بەو جوانیو ڕێكو پێکی‌یە بهۆنێتەوە، وە بەو چەشنە جوانە، دیمەنی دڵرفێنی بەهارو جوانی یەکانی بەهاری شاخو شەتاو باخو گوڵزارە شیرینەکانی کوردستان دەربخا.

جگە لەوەش کەوتمان مەستوورە لە هۆنراوەکانیا ناوی گەلێ لە سەیرانگاو شوێنە جوانەکانی ئەو سەردەمەی دەوروبەری سنەی وەکوو: (فیردەوس) و(کارێز)و (باوەرێن) ناو بردووە کە بەداخەوە ئێستاکە زۆرتریان کاول بوون، وە تەنیا تەنیا ناوو نیشانێکیان لێ بەجێ‌ماوە.

* گرفتارم بە نازی چاوەکانی مەستت

گرفتارم بەنازی چاوەکانی مەستی فەتانت
بریندارم بەتیری سینەسۆزی نێشی موژگانت
بە زولفو پەرچەم‌ولەگریچەکانت غارەتت کردم
دڵێکم بوو ئەویشت خستە ناو چاهی زەنەخدانت
جەنابا عاشقان ئەمڕۆ هەموو هاتوونە پابۆست
منیش هاتم بفەرموو بمکوژن بکەن بە قوربانت
ئەشەکور واجبە بۆ من ئەگەر بمرم بە زەخمی تۆ
لە کوشتن گەردنت ئازاد دەکەم ئەگەر بێتە سەر قەبرم
بەڕۆژی جومعە بمنێژی لە لای جەمعی شەهیدانت
کەسێ تۆ کوشتبێت ڕۆژی حەشر زەحمەتی نادەن
ئەگەر وەک من لە ئەم دونیایە سووتابێ لە هیجرانت
هەمیشە سوجدە گاهم خاکی بەر دەرگانەکەی تۆیە
ڕەقیب رووی ڕەش بێ تایێلێ بکا دەستم بەدامانت
لە شەرطو هەم وەفاداری خۆ تۆ مەشهوری ئافاقی
فیدای شەرطو وەفات بم، چی بەسەر هات عەهلی جارانت
ئەمن ئەمڕۆ لە مڵکی عاشقی دا نادرەی دەهرم
بە ڕەسمی بەندەگی عاشق هەموو هاتوونە دیوانت
برۆ (مەستوورە) شوکرێ کە لە دەرگای پادشای داوەر
کە شۆڵەی ڕۆژی ڕووی والی دەگاتە کۆشکو ئەیوانت





### ڕۆحی شیرینم

ڕۆحی شیرینم لە بۆچی ئەمڕۆ وا لطفت نیە
نووری بینای چاوەکانم پێم بڵێ سووچم چیە
بێ قەباحەت لێم زویری، چاکە ئینصافت نیە
تا کە ئەمرم خۆ مەحاڵە ڕوو بنێم لەم قاپیە
خوێن لە چاوانم خرۆشاوە فووارەی بەستووە
جاریێ نابێ بێتە سەر ئەم حەوز و فوارەو کانیە
چاوەکانی کاڵە لێوی ئاڵە خاڵی ماویە
گاکە تۆ خێرا پێ بکەی بۆ پەنجەکەی خوێناویە
ئاگری عیشقت وەها کوورەی دڵی هێناومە جۆش
شێت و شەیدای کردگم ئاگام لە دنیای خۆم نیە
ئاڵەیی امەستوورەایە وا خەڵقی خستە زەلزەلە
یا ئەخۆ حەشرە، گونەهکارە وەها هاواریە(*)



# بۆچونێکی تر سەبارەت بە (مەستوورە)ی ناوقەسیدەکەی نالی

ڕێبوار سیوەیلی

ئەمجۆرە خوێندنەوەیەی قەسیدەکە لە خۆ خەریك کردن بەو کێشانەوە ڕزگارمان دەکات کە ئایا بەڕاستی مەبەستی نالی لە مەستورە، مەستوورەی ئەردەڵانە؟ لەکوێ ئەم قەسیدەیەی نووسیوەو لەکام تەمەنا؟ ئەویش لەبەر چەند هۆیەك:

یەکەم: ئەگەر بێت و مەستوورەی نێو قەسیدەکە بە مەستوورەی ئەردەلانی شاعیرو مێژوو نووس و ئەدیب لە قەڵەم بدەین؛ وە بشڵێین بەڵگەمان بۆ ئەمە ماوەی خوێندنەکەی نالی‌یە لە شاری سنە تەماشای (لاپەڕە 68و بەرەو دوای دیوانی نالی بکە) یان بڵێین نالی مەستوورە بە ئەدیب ناو دەبات و مەستوورەی ئەردەڵانیش خوێندەوارو ئەدیب بووە.. ئەمە ڕێی تێدەچێت. ئەویش بەمەرجێك: کە بە بەڵگەوە ڕوونی بکەینەوە زاراوەی ئەدیب لە سەردەمی نالی‌دا بەهەمان مانای ئەمڕۆ بەکار هاتووەو پێناسەی کەسێکی خاوەن قەڵەمی پێکراوە کە بابەتی شیعرو چیرۆك و ژانرەکانی دیکەی ئەدەبی بەرهەم هێنابێ.. ئەگەرنا کاتێك ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای تێکستە شیعرییەکە، ئیدی هەموو بەڵگە ئامادەکراوەکانی لەوە بەرهەڵدەوەشێنەوە. چونکە مەستوورەی نێو قەسیدەکە کەسێك نییە، سەرجەمی ئافرەتێك نییە بە هەموو ڕەهەندە ئینسانیەکانیەوە، ڕەهەندە بایۆلۆجی و فیزیکی‌یەکانیەوە، بەڵکو ئەندامی جنسی ئافرەتەو بەس. ئاشکرێ دڵی خۆمان بەوە خۆش کەین سیفەتی ئەدیبی بدەینە پاڵ ئەندامی جنسی و کاری وانەشیاوە

دووەم: ڕاستە نالی مەستوورە بەحەسناوو ئەدیب ناو دەبات، بەڵام خۆ دەکرێ وەسفی حەسناو ئەدیبی بدرێتە هەر ئافرەتێکی دیکەش. هەر وەکو چۆن دیمەنە وەهمی‌یەکەی شاعیر لەبارەی عەورەتی مەستوورەوە، بۆ عەورەتی هەر ژنێك تەفسیر دەکرێت.. واتە، نە سیفەتی (حەسناوو ئەدیب) و نە ئەو بەڵگانەی دەیانەوێ ئیسپاتی (سنەیی) بوونی مەستوورە کەی نالی بکەن.. لە دینامیەتی قەسیدەکەدا؛ لە ڕەوتی دەقە شیعریەکەدا دەوریان نامێنێ، لەبەر ئەوەی وەکو لە پێشاندا گوتم، نالی باسی کەسێك یان فەردێك ناکات، باسی ئەندامی مێینەی ژن دەکات. هەر ژنێك.. یان یەکێکی تایبەت کە نالی خۆی دەزانێ کێ‌یە.. چی لە مانای هاوکێشی خۆی یان نزیك لە خۆی لە جێگە دابنێین؟ وەك :

مەحبووبە، حەبیبە، شوکریەو هتد.

مەحبوبە کە حەسناوو ئەدیبە بە حیسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێك و عیتابێ

یان:

ئایینە بە مایینە دەبێ ڕەنگ نومابێ
شوکریە بەمەستورە دەبێ موهرە گوشابێ

هەڵبەتە من کاتێك زاتی پێشنیاری ئاوام هەیە کە دەبینم لە لێکدانەوەی قەسیدەکەشدا، مەستوورە جگە لەوەی وەکو ناوێك بۆ ئافرەتێك مامەڵەی لەگەڵ کراوە، هیچ ڕۆڵێکی تری نەدراوەتێ. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم قسەیەش،



لێرەدا دوو نموونە لە خودی دیوانی نالی‌یەوە قەرز دەکەم تا خوێنەر مەبەستەکانی زیاتر لێ شاکرا ببێت.

نمونەی یەکەم:

حەسنا: حەسنا، ئافرەتی جوان. عیتاب: لۆمەو گلەیی واتە: مەستوورە کە بە ئافرەتێکی جوان‌و ئەدیبی دا ئەنێت، ئەمشەو هاتە خەوم، بەلام چۆن نازێکی بەسەردا نەکردم‌و چۆن بەگلەیی‌و لۆمە بوولێم؟! تەماشا دەکەین لەم لێکدانەوەیەدا نرخی وشەی مەستورە لەوەدایە کە ناوە بۆ ئافرەتێك هەروەکو چۆن دەشێی وشەی مەحبوبەش ناو بێ بۆ ئافرەتێ. واتە ئەوەی کە ئەو ئافرەتە ناوی مەستوورەیە. یاوەکو ناوێکی دی (بەمەرجێ لەگەڵ جوانکاری‌و کێشی بەیتە شیعرییەکەدا بگونجێ)، لە گۆڕینی مانای وشەکان دوای خۆیدا دەورێکی نییە

ئایینە بەمایینە دەبێ ڕەنگ نومابێ

نمونەی دووەم: (مەستوورە) بەمەستوورە دەبێ موهرە گوشابێ

ئایینە: ئاوێنە. مایینە: ئاواوی ، تێکەڵ بە ئاو

ڕەنگ نوما : ئەوەی تیشك بداتەوە . بە مەستورە : بەم ئەستورە ، یا خود بە مەستورە ، واتە بەشتی داپۆشراو کە مینەکەی نالییە . موهرە گوشا: سەر قاپ کراوە ، کینایەیە لە کچی بەژن کراو .

واتە : ئەبێ (ئاوێنەکەی) مەستورە خانم بە شتێکی ئاواوی و وەك ئاو پاك بکرێتەوە تا ڕەنگ بداتەوە و ، سەر قاپی مەستورە خۆیشی بەم شتە ئەستورە یا بەم شتە شاراوەیەی نالی بکرێتەوە )

لێرەدا تەماشا دەکەین (مەستورە)ی یەکەم خراوەتە دوو کەوانەوە و لە شەرحیشدا هیچ کاریگەرییەکی بەلاغی و مانا سازی بەنیسبەت وشەکانی ترەوە نیە . بۆیە هەر وەکو خۆی ، واتە وەك ناوێ بۆ ئافرەتێك ماوەتەوە ، کە ئەم ناوە لەم قەسیدەیەدا ، دەکرێ ناوبێت بۆ هەر مەستورەیەك کە لەسەر دەمی نالی داژیابێ ، بەبێ ئەوەی مەبەستی نالی سەرجەمی کەسایەتی ئەو ( مەستورەیە) بێت .

پێشنیاری ئەوەی دنەمان دەدات بۆ گۆڕینی ناوی مەستورەی نێو قەسیدەکە و جوێ کردنەوەی لە مەستورەی سنەیی ، فەرزیاتێکن کە بۆ شیعری نالی ڕاستن . چونکە ، هەروەکو دەزانین نالی لە هەندێ قەسیدەی کەیشیدا ، بۆ نمونە ئەوانەی باسی (حەبیبە) و ( مەحبوبە ) یان تێدایە ، واژەی حەبیبە و مەحبوبە ناوێکی دیکەن بۆ ئافرەتێك کە ئێمە تا ئێستایش ناوە حەقیقی و ئەسلیەکەی نازانین و نالی بە شاراوەیی هێشتوویێتی‌یەوە . بە خۆڕایش نیە ، گەریدە و شاعیری گەورەی کورد "پیرەمێرد"لەم بارەیەوە گوتویەتی : (لەنەظەر مندا حەتتا حەبیبە-ی مالیاوەش شەخصییەتێکی حەقیقی نەبووە و تەنها ڕەمزێکە حەزرەتی نالی کردویە بە واسیطەی ئیظهاری دەهای شاعیرانەی ) .

لێرەشدا ڕێی تێدەچێت واژەی (مەستورە) ناوێکی خوازراو بێت بۆ ئافرەتێکی تایبەت کە دیسانەوە بۆ ئێمە نەناسراوە . دووریش نیە ئەم مەستورەیە ناوێکی خوازراوی تر بێت بۆ(حەبیبە) وحەبیبەش ناوە بۆ ناوێکی ترو بەم پێیە نالی ویستبێتی ئەسلی کەسەکەمان بەجارێ لێ وون بکات. دیارە بە لەبەر چاوگرتنی بار و دۆخی سەردەمی ژیانی مەلا خدریش ، بەتایبەتی بۆ نووسینی قەسیدەیەکی لەم بابەتە ، دەبوو ئەو کارە بکات ، دەنا بۆ سبەی لاشەیان بە دەروازەی شارەوە هەڵدەواسی .

**مەستورە لە ڕوانگەیەکی ترەوە**
ل63-67

## هەمدیسان سەبارەت بە قەسیدەکەی (نالی)

( نالی) مردو (مەستورەش) رەش مرد و هەمووکەسی کەش ئەمرن 0 ئەوەی بەش بەحاڵی کورد لەم دوانە بەجێ مابێ ئەدەبەکەیانە0 بۆ ئەدەبی کورد چەند جوان ئەبو ئێمەش چەند" شێخ ڕەضا "ی ترمان بوایە و ئەدەبەکەمان چەند دەوڵەمەند تر ئەبو ئەگەر نالی چەند قەسیدەی تری وەك ئەوەی لەمەر مەستورە وتبایە و مەستورەش وەڵامی دابایەتەوەو شاعیرەکانی تریش شیعری تریان دانابوایە 0 ئەوە بۆ ئێمە زۆر بایەخ تر ئەبو لەوەی بڵێین ئەدەبەکەمان ئەدەبی مەلانیکەتەکانە و لەکارو باری سەروی زەوی نادوێ 0 کات و شوێنی ئەم خەوبینینەی( نالی ) :

کەلەوەلام دانەوەی ڕەخنەکانی لەمەڕ مەستورە خانم بوینەوە ، بێجێ نابێ باسێکی کاتی خەوبینینەکەش بکەین و کەمێك لێی بکۆڵینەوە 0 وەك مەشهورە ، نالی لە سنەش خوێندوێتی 0 وەك ئایەتوڵلای مەردۆخیش ئەڵێ ، مەستورە خانم لە ی.ك( 1828-1829ی0ز) دا شوی بەکەی خەسرەو خانی ناکام کردوە.

گومان لەوەدانیە کە ئەم دوانە (نالی‌و مەستورە) هاوچەرخ بوون.

بەڵام نالی لە کوێ و کەی ئەم خەوەی دیوەو قەریحەی کراوەتەوەو ئەم هەڵبەستەی ڕازاندوەتەوە؟ ئاخۆ لە سنە یا لە دەرەوەی سنەدا، پێش شوکردنی مەستورە یا پاش شوکردنی؟ ئەمانەش وەك هۆی وتنی قەصیدەکەی، هەموو بێ سەرو شوێن ماونەتەوەو تەنها بە توێژینەوە ئەبێ شتێکمان لە بارەیانەوە بۆ ساغ ببێتەوە.

باوکم بۆی گێڕامەوە کەوا لە مامۆستا شێخ بابە ڕەسوڵی عەبابەیلێی بیستوە کەوا ((نالی لە سنە لە مزگەوتی دارول ئیحسان خوێندویەتی و، ئەو ڕۆژەی ئەم قەصیدەیەی تەواو کردوە، بۆ شەو سنەی بەجێهێشتوەو بەرەو عێراق گەڕاوەتەوە)). مزگەوتی دارول ئیحسانیش ئەمانوڵڵا خانی والی باوکی کەیخوسرەو خانی ناکام دروستی کردوە.

جا ئەگەر نالی لە سنە بوبێ و لە پاش شوکردنی مەستورە ئەم قەصیدەیەی وتبێ، ئەوا بەپێی ئەو ساڵەی کە بۆ لە دایك بونیان داناوە، واتە 1215ی.ك، ئەبێ ئەو دەمە لە تەمەنی 29–30 ساڵاندا بوبێ ولەوێ فەقێ بوبێ. سی ساڵیش بۆ فەقێیی زیرەك درەنگەو بۆ ئەوە ئەشێ گومانی لێ بکرێ، یا خود ئەبێ بڵێین لە ئاخرو ئۆخرێ سەردەمی ئیجازە وەرگرتنیدا بوە. خۆ ئەگەر پێش شوکردنی مەستورەش وتبێتی، ئەوا ئەبێ تەمەنی لە 29 ساڵ کەمتر بوبێ و ئەمەش زیاتر ڕێی تێ ئەچێ.

زۆربەی تەعبیرو وشە بەتوێکڵەکانی نالی ئەوە ئەگەیەنن مەستوورە لەو کاتەدا شوی نەکردبێ، وەکو ئەمانە: ((عوقدەم هەیە))، ((هی تۆم))، ((ئەم مەسەلە حەل کەی))، ((بیکر))، ((مومکن نیە کەس دەخلی بکا))، ((میثلی سوها بێ نەسوابێ))، ((دوڕڕی سەما بێ نەسمابێ))، ((نەقوپابێ))، ((ئاوی نەدرابێ))، ((طەلیسمی نەشکابێ))، هێشتاکو لە حەق جێگەیی خاصی نەدرابێ))، ئیکسیری‌تەڵای ئەحمەری چەن قەطرە لە لابێ))، ((دەعوای ئومەرا چەند لەسەر تەختی کرابێ))، ((چەند خوێنی ڕژابێت و چ خوێنی نەڕژابێ)).. تاد.

ئەمانە هەموو هیی تریش ئەوە ئەگەیەنن کەوا مەستوورە لەوکاتەدا شوی نەکردوە. بێ گومان (مەستوورە خانم)ی ئەدیب پێش شوکردنیش جێگەو ڕێگەو دەست پێوەنددار بوە. لەبەر ئەوە دور نیە نالیی داماو پاش ئەم (کەتن!)ە لە ترسانا ڕای کردبێ. ئەو وا لەوێ ئێستەش هێشتا دەست لە یەخەی ناکەنەوەو هێناویانەتە هەتیتە، جا ئەخوازەڵڵا ئەو سەردەمە!.

بەڵام لە بەشی وەڵامەکەیدا بەیتێك هەیە، بە بارێکدا مەعنای شوکردنی مەستورە ئەگەیەنێ. بەیتەکە ئەمەیە:

شەو نائیم و قائیم بابی ڕەضا بێ

بێ دیدە هەڵستێ بە مەپەل عەینی عەصا بێ

ڕستەی ((بابی ڕەضا)) وەك مەعنای (دەرگای قەناعەت) ئەگەیەنێ، مەعنای (باوکی ڕەضا قولی خان)یش ئەگەیەنێ (کە کوڕی کەیخوسرەو خان بوە لە ژنە فارسەکەی : حوسن جیهانی کچی فەتح عەلی شای قاجار.

واتە چاری ئەم مەسەلەیە بە دێوانەیەك ئەکرێ شەو لە خەویشدا بەپێوە بێ و نالای ماڵی باوکی ڕەضا قولی خان بێ! ئەگەر ئەم بارە ڕەوابێ، کۆکردنەوەی مەستورە لەگەڵ ڕەضادا ئەوە ئەگەیەنێ کە مەستورە لەو سەردەمەدا ژنی کەیخوسرەو خان بوە.

فاتح مەلا عەبدالکریم مدرس

(لە پێشەکی دیوانی نالی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم)

وەرگیراوە .. کەساڵی 1976 چاپ کراوە لە بەغدا



# دەقی ئاو لە ئاوێنە

دلشاد عبدالله

کەسێك دەچێتە دوکانی توحفە فرۆش‌و
تاسێکی سوورو سوهاو
پەڵە بەفرێکی نەشکاو
دەگرێ.
کەسێك لەلای بەیانی دەپشکوێ‌و
نامەیەك دەهێنێ
دڵ پڕ دەکا تا باخچە پڕ دەبێ
کەسێك کۆترەکان ئافرێنێ
لە گردی شیرین‌و نەمەگین
یەعنی دامێنی گوڵ دەگرێ
کەسێك لە مەستوورە دەچێ
چەند دەنکە فەیروزەیی ئاسمان
بەعاستەم کەوتۆتە ناوچاوی
تەماشای لارکردۆتەوە
لای
کەسێك.
کەسێك دەستی خستۆتە ناودەستی
وەرزێکی ئازادو
گۆزەی گەنجینەی بن کراس
پڕبووە لەخەون‌و
لایەکی کەوتۆتە سەر ئاو
گرفتارە لەسەدلاوە بەدەستی قافی‌یە
کەسێك گەیشتۆتە دۆخی خۆر
بەتایبەتی
کە شیعر دەستی بۆ دەباو
بەو هەموو لەعل‌و ئاقیق‌و جورئەت‌و
غەزەلەوە
لە بەحری هەزەلەوە

دەیباتە ناو شەوی مەعناو
پڕ لە خۆشی
باخچەکانی
کەسێك
هەموو شتی لە مەستوورەیی ئاو دەچێ
شەبەهی شەوق‌و
بێئاگایی‌و
تامی مێخۆشی دەنکێکی‌و
چاوی شیعرێکی شاراوەی
ناو عەشقی
نیشانەی‌پرسیاری .
شەو نووستوو بێدار
مەستوورە چۆن توانی
دەریایەك بە کۆش هەڵبگرێ؟
یەعنی چۆن جێ‌ی ئەو هەموو ئافات‌و
ئامان‌و
سووتانەی
کردەوە؟
ج زوو ئەو هەموو شەپۆلەی خڕ کردەوە
کەسێك سەری لەشیعرێك تێکدا
ئەمما بەسیرێکی
سەد وەڵامی لە دەستی نا.

سەرنجێك: هەندێ‌و وشەو دەستەواژەو وێنەی شیعری لە قسیدەکەی نالی وەرگیراوە کە بۆ مەستوورەی نوسیووە.

---

## ژمارەی داهاتوو
## تایبەتە بە مەولانا خالیدی نەقشبەندی